


- ناوی گۆڤار : ئەکادیمی.
- بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی.
- سەرپەرشتیی هونەری و بەرگ : محەمەد زادە.
- ڕێکخەری بابەتەکان : شیلان جەلال .
- پیت چنین : عەبدولحەمید عەزیز ڕەسوڵ ـ زاهیر عومەر وەلی .
- هەڵەگری : شێرزاد فەقێ ئیسماعیل.
- تیراژ: ٥٠٠ دانە.
- چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر ٢٠٠٩

# ناوەرۆك


**١- چالاكی بازرگانیی كەركوك لە سەدەی نۆزدەهەمدا**

***پ. ی. د. سەعدی عوسمان هەروتی***

***م. ی. بەختیار سەعید شوانی*** ................................................. ١٥

**٢- شرۆڤەكرنا دیسكۆرسی ــ رێزمانی بۆ چیرۆكا (مرێبایێ ئاغای)**

***م. عەبدولسەلام نەجمەدین عەبدوڵلا*** ................................. ٥٢

**٣- بەڵگەنامەكانی كوردستان**

***محەمەد عەلی قەرەداغی*** ........................................................ ٨٦

**٤- دیكارت و ئەقلانییەت .**

***م. رێبوار حەمە ئەمین حەسەن سیوەیلی*** ................................... ١٢٧


## القسم العربي:


**١- عالِم الحِيَل إبن الرزاز الجزري .**

***د. اكــو برهان محمد*** ........................................................ ٢١٥

**٢- دراسات عن الكرد وكوردستان باللغة الروسية (١٧٨٠-١٩٠٠).**

**أ. د. جبار قادر** ...................................................................... ٢٥٤

# ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە
# لە گۆڤاری ( ئەکادیمی ) کوردی دا

گۆڤاری ئەکادیمی گۆڤارێکی وەرزییە. لێکۆڵینەوە زانستییەکانی ناوەوە و دەرەوەی هەرێمی کوردستانی عێراق، بڵاو دەکاتەوە. بەگوێرەی ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە، لێکۆڵینەوەکان بۆ پلەی زانستیی سوودمەند دەبن. بۆیە پێویستە لێکۆڵینەوەکان گرفت و ئاریشەکی دیاریکراو یان پێشبینی کراو، چارەسەر بکەن و، بیرو هزرێکی ڕەسەن یان تازە لە خۆ بگرن، یان لایەنێکی زانستی بدۆزنەوە. نابێت لێکۆڵینەوەکان لە هیچ گۆڤارێکی دیکە بڵاو کرابنەوە یان پەسەندی بڵاوکردنەوەی لەسەر درابێت.

# ڕێنماییەکانی تایبەت بە شێوە و ناوەرۆك و پێکهاتووی لێکۆڵینەوە

(١) لێکۆڵینەوەکە، بە چوار دانە، لەسەر کاغەزی سپی پێوانە (A4)، بە مەرجێك لە هەر چوار لاوە، دووری (٢,٥)سم بەجێ هێشترابێت، دەنێردرێت. ژمارەی گشت لاپەڕەکانی لێکۆڵینەوەکە، بۆ زانستە ڕووتەکان و پراکتیکییەکان لە (٢٠) لاپەڕە تێپەڕ نەکات و، لێکۆڵینەوە زانستە مرۆییەکانیش، بە وێنە و خشتەکانیانەوە، لە (٢٥) لاپەڕە پتر نەبێت .

(٢) لەگەڵ لێکۆڵینەوەکە، هاوپێچێك هەبێت، ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە و ناو و شوێنی کارکردن و پلەی زانستی و کار و وەزیفەی لێکۆڵەر، لە خۆ بگرێت.

(٣) زمانی بلاوکردنەوە، زمانی کوردییە، بەلام لێکۆڵینەوە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزیش بلاو دەکاتەوە. کورتەی لێکۆڵینەوەکەش Abstract، بە هەر سێ زمان دەبێت.

(٤) ناوەرۆك و پێکهاتەی لێکۆڵینەوەکە بەم جۆرە دەبێت:

أ) ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە، بە شێوەیەکی کورت و پوخت و گشتگیر، لە ناوەڕاستی سەرووی لاپەڕەی یەکەم، دادەندرێت.

ب) کورتەی (Abstract) لێکۆڵینەوەکە، بە دوو زمانەکەی تر دەبێت، کە لێکۆڵینەوەکەی پێ نووسراوە، بەمەرجێك لە (١٥٠) وشە تێپەڕ نەکات و ئەو ئامانج و ئەنجامە لە خۆ بگرێت، کە لێکۆڵەر پێی گەیشتووە.

(ج) پێشەکی و ناوەرۆك و ئەنجام.

(٥) شێوازی سەرچاوەکان لە پەراوێزدا:

أ) ئەگەر وەرگرتنی بێ دەستکاریی (الاقتباس) لە کتێب وەرگیرا، ناوی نووسەر یان دانەر بەبێ پاش و پێش، ناونیشانی تەواوی کتێبەکە، ناوی بڵاوکەرەوە، چاپ (جگە لە چاپی یەکەم)، شوێن و ساڵی چاپکردن، لاپەڕە، تۆمار دەکرێت.

ب) ئەگەر وەرگرتنی بێ دەستکاریی (الاقتباس) لە لێکۆڵینەوە وەرگیرا، ناوی لێکۆڵەر، ناونیشانی لێکۆڵەر، ناوی گۆڤار، ژمارەی گۆڤار، شوێن و ساڵی چاپ، لاپەڕە، تۆمار دەکرێت.

(٦) ئەگەر لێکۆڵینەوەکە ساغکردنەوەی دەستنووسێك لەخۆ بگرێت، پێویستە ڕێوشوێنی بنەما و پرۆگرامی زانستی لەگەڵ لێکۆڵینەوەکە، هاوپێچ بکرێت.

(٧) بەرەچاوکردنی بیرۆکەی بنەڕەتی لێکۆڵینەوەکە، دەستەی نووسەران، ئەو مافەی هەیە دەستکاری هەندێ لایەنی داڕشتن بکات بۆ ئەوەی لەگەڵ شێوازی بڵاوکردنەوەیدا، بگونجێت.

(٨) وا باشە لێکۆڵینەوەکە لەسەر (CD) تۆمار کرابێت و چوار دانەی ڕاکێشراویش لەگەڵیدا هاوپێچ بکرێت.

(٩) لێکۆڵینەوەکە، نیشانی سێ شارەزای پسپۆڕی بابەتەکە دەدرێت، ئەگەر پەسەند کرا، ئەوا لەلایەن دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە، ڕەزامەندی لەسەر دەدرێت.

(١٠) ئەو لێکۆڵینەوانەی گۆڤاری ئەکادیمی بڵاویان دەکاتەوە، دەربڕین لە بیرو بۆچوونی نووسەر دەکەن، پێویستییەتی دەربڕینی گۆڤارەکە، ناگەیەنن.

**دەستەی نووسەران**

# تعليمات النشر
# في مجلة ( الأكاديمي ) الكوردية

المجلة مجلة فصلية. ينشر فيها النتاج العلمي من داخل وخارج اقليم كوردستان ـ العراق. وتكون البحوث مستوفية للتعليمات الخاصة بالنشر وتخضع للتقويم العلمي. ويتعيّن ان يتضمن البحث حلاً لمشكلة قائمة أو متوقعة، أو يتضمن فكرة أصيلة أو جديدة أو اكتشافاً علمياً، على ان لايكون منشوراً أو مقبولاً للنشر في مجلة أخرى.

# التعلميات الخاصة
# بالشكل وترتيب البحث

١. يرسل البحث بأربع نسخ على اوراق بيضاء من قياس (A4) مع ترك مسافة ٢,٥سم من الجهات الاربعة، على ان لايزيد عدد الصفحات الكلية للبحث عن (٢٠) صفحة لبحوث العلوم الصرفة والتطبيقية وعن (٢٥) صفحة لبحوث العلوم الانسانية بضمنها الاشكال والجداول.

٢ـ ترفق بالبحث ورقة تتضمن عنوان البحث وإسم الباحث ومركز عمله، ومرتبته العلمية ووظيفته.

٣. لغة النشر هي اللغة الكوردية، ولامانع لنشر بحوث باللغتين العربية او الانكليزية. وتوضع الملخصات Abstracts باللغات الثلاث.

٤. يرتب البحث على النحو التالي:

أ. عنوان البحث: يتوسط أعلى الورقة الاولى، ويفضل ان يكون قصيراً وشاملاً.

ب ـ يوضّح الباحث الهدف من البحث والنتائج والتوصيات المهمة التي توصّل اليها.

ج ـ المقدمة والمتن والنتائج.

٥. اسلوب ترتيب المصادر في الهوامش.

أ ـ إذا كان الإقتباس من كتاب: يدوَّن اسم المؤلف. بدون قلب الاسم، عنوان الكتاب بالكامل، الناشر، الطبعة، (عدا الطبعة الاولى)، مكان وتاريخ الطبع، الصفحة.

ب ـ إذا كان الإقتباس من بحث: يدوَّن اسم الباحث، عنوان البحث، اسم المجلة الناشرة، رقم المجلة أو العدد، مكان وتاريخ النشر، الصفحة.

٦ـ حين يكون البحث تحقيقاً لمخطوطة تتبع القواعد والمناهج العلمية المعروفة، وترفق بالبحث ست صفحات من المخطوطة.

٧ـ تحتفظ هيئة التحرير بحقّها في أن تحذف أو تعيد صياغة بعض الالفاظ، بما يتلاءم مع اسلوبها في النشر، مع مراعاة المحافظة على الفكرة الأصلية دون المساس بها.

٨ـ يستحسن ارسال البحث على CD وارساله برفقة النسخ المذكورة.

٩ـ يعد البحث مقبولاً للنشر، ويزوِّد الباحث بقرار هيئة التحرير بقبوله بعد عرضه على ثلاثة محكّمين (خبراء) من ذوي الاختصاص.

١٠ـ ماينشر في المجلة يعبّر عن وجهة نظر الباحث، وليس بالضرورة تعبيراً عن وجهة نظر المجلة.

**هيئة التحرير**

IRAQI KURDISTAN REGION
MINISTERY OF HIGHER EDUCATION
& SCIENTIFIC RESEARCH
UNIVERSITY OF SALAHADDIN - Erbil
Vice President Office
For Scientific Affair



هەرێمی کوردستانی عێراق
وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی
سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین / هەولێر
نوسینگەی یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ کاروباری زانستی

ژمارە ٢/ ٨٩٤٩

مێژووی زاینی ٧ / ٥ / ٢٠٠٨
مێژووی کوردی ١٧ / ٢ / ٢٧٠٨

**بۆ/ ئەکادیمیای کوردی/ بەڕێز سەرنووسەری گۆڤاری ئەکادیمی کوردی**

**ب/ ڕەزامەندی**

**سلاو و ڕێز..........**

ئاماژە بە نووسراوتان ژمارە /٣٥٤ لە ٢٠٠٧/١١/١٩ .

دەربارەی ڕەزامەندی ئەنجومەنی زانکۆکەمان لەسەر ئەوەی کە گۆڤارەکەتان ببێتە گۆڤارێکی ئەکادیمی / زانستی و پشتی پێ ببەسترێت بۆ بڵاوکردنەوەو بەرزکردنەوەی پلەی زانستی ، دوای ئەوەی کە خرایە بەردەم ئەنجوومەنی زانکۆ لە دانیشتنی کۆنووسی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی زانکۆمان ژمارە (٨) ڕۆژی سێشەممە لە ڕێکەوتی ١/٤/ ٢٠٠٨ بەسترابوو. وە ئاماژە بە نووسراوی وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی ژمارە ن / ٢٣٥ لە ٢٠٠٨/٥/١٧ بە پەسند کردنی بڕیارمان دا بەرازی بوون و پەسندکردنی وەکو گۆڤارێکی زانستی / ئەکادیمی لەگەڵ ڕەچاوکردنی چەند تێبینی یەکی بچووک .......... لەگەڵ ڕێزدا

**هاوپێچ//**

- تێبینیەکان

**د. محمد صدیق محمد**
**سەرۆکی زانکۆ**

**وێنەیەك بۆ//**

- نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی زانکۆ / لەگەڵ ڕێزدا
- نووسینگەی بەڕێز یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ کاروباری زانستی/ لەگەڵ بەراییەکان
- لیژنەی ناوەندی بەرزکردنەوەی پلەی زانستی لە سەرۆکایەتی زانکۆ
- دەرکردە

Kurdistan Regional Government
Presidency of Ministers Council
Ministry of Higher Education
and Scientific Research
Presidency of University of Koya
Office of President




حکومەتی هەرێمی کوردستان
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی
سەرۆکایەتی زانکۆی کۆیە
نووسینگەی سەرۆك

ژمارە: ٧/ ٢٩/ ٢١٨٩      بەروار: ٢/ ٦/ ٢٠٠٨

**﴿فەرمانی زانکۆیی﴾**

**بابەت / ناساندنی گۆڤار**

ئاماژە بە خاڵی (١) تەوەرەی سێ یەم کاروباری زانستی لە کۆنووسی چواردەمین کۆبونەوەی ئەنجومەنی زانکۆ لە ٢٠٠٨/٥/٢١ وە دوای هەڵسەنگاندنی گۆڤاری ئەکادیمی کوردی بڕیار درا بە :-

ناساندنی ئەم گۆڤارە وەك گۆڤارێکی ئەکادیمی و زانستی بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکان و وەك گۆڤارێکی ئەکادیمی مامەڵەی لەگەڵ بکرێت

**پ. د. خدر مەعصوم**
**سەرۆکی زانکۆ**

وێنەیەك بۆ

- نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی زانکۆ
- بەڕێزان یاریدەدەرانی سەرۆکی زانکۆ
- ڕاگرایەتی گشت کۆلیجەکان
- دۆسیەی دەرچوو

www.koyauniversity.org      dnya

# چالاكی بازرگانیی كەركوك لە سەدەی نۆزدەهەمدا توێژینەوەیەكی مێژوویی

**پ. ی. د. سەعدی عوسمان هەروتی**
بەشی مێژوو - كۆلیژی ئەدەبیات
زانكۆی سەلاحەدین ـ هەولێر

**م. ی. بەختیار سەعید شوانی**
بەشی مێژوو- كۆلیژی زانستە مرۆڤایەتییەكان– رانیە
زانكۆی كۆیە

## پێشەكی

مەسەلەیەكی بەڵگە نەویستە كە بازرگانی ڕۆڵی خۆی لە ژیانی مرۆڤدا گێڕاوە، لەم چوارچێوەیەدا مرۆڤ هەوڵی داوە ئەو بەرهەمانەی كە لە خۆی زیادە بیانفرۆشێ و ئەویش كە پێویستن بۆ ژیانی ڕۆژانەی بیانكڕێ و پەیدای بكات. هەر ئەمەش پاڵی بە مرۆڤەكانەوە ناوە كە لەپێناو قازانجدا ئەو شتانەی لە پێداویستی و بەكارهێنانی ناوچەكەوە زیادن بیانگوازێتەوە بۆ هەرێم یان ناوچەیەكی تر كە پێویستییان پێیەتی. دیارە ڕێژەی بەرهەم و هەروەها ڕادەی پێویستی بوون بەپێی كات و شوێن جیاوازە، بۆیە ئاستی پەرەسەندنی بازرگانی لە ناوچەیەكەوە بۆ ناوچەیەكی تر و هەروەها لە سەردەمێكەوە بۆ سەردەمێكی تریش جیاوازی هەیە.

كەواتە كرداری بازرگانی تەواوكەری چالاكییە ئابورییەكانی ترە كە لەپێناو پڕكردنەوەی پێداویستی مرۆڤ ئەنجام دەدرێن. لە هەمان كاتیشدا نیشاندەری ڕاددەی پەرەسەندنی ئابووری و تەنانەت بەدیارخەری ئاستی شارستانی هەر ناوچەیەكە. لە سۆنگەی ئەمەوە توێژینەوە لە چالاكی بازرگانی دەڤەری كەركوك لەماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا بایەخێكی دیاری هەیە بەتایبەتی كە توێژینەوەی ئەكادیمی لەسەر ئەم لایەنە نەكراوە، لەكاتێكدا لایەنەكانی تری مێژووی كەركوك (بەتایبەتی سیاسی) زۆری لەسەر نووسراوە.

ئـەم توێژینەوەیــە بەچـەندین سەرچـاوەی مێـژوویی ڕەســەن پــشت ئەسـتووره ، کـە گرنگترینیـان سـاڵنامەکانی ویلایـەتی موسـڵی سـەردەمی عوسمانین کە چەندین زانیاری گرنگیان لەسـەر لایـەنی ئـابووری دەڤـەری کەرکوك تێدایە، بـەو پێیـەی کـەرکوك مەڵبەنـدی سـەنجەقێکی سـەر بـەم ویلایەتـە بـوو لـە مـاوەی نووسـینی ئـەم سـاڵنامانەدا. هـەروەها گەڕیـدە بیانییــەکانیش (وەك: کلۆدیـۆس جـیمس ریــچ-١٨٢٠، جـیمس بیکنگهـام - ١٨١٦ و هـیتر) لـە گەشـتنامەکانیاندا زانیـاری و سـەرنجی زۆریـان لـەبارەی چـالاکییە ئابورییــەکانی ناوچــەکە تۆمــار کــردووە و ســەرنجی کــاری بازرگانییـان داوە. بێگومـان کتێـب و توێژینــەوە هاوچـەرخەکانیش نـابێ لێــرەدا فــەرامۆش بکــرێن، بۆیــە ژمارەیــەکی زۆری ئەمانــەش لــەم توێژینەوەیەدا بەکارهاتوون.

**یەکەم/ بایەخی کەرکوك لە ڕووی بازرگانییەوە:**

دەتوانین بڵێین دەوڵەمەنـدی کـەرکوك بـە بەرهـەمهێنانی بـەروبوومی کشتوکاڵی و سامانی ئاژەڵی ببووە هـۆی گـەرمبوون و بووژانـەوەی بـازاڕی ناوخۆی شارەکەو دروستبوونی بازاڕی دەرەکی. لەم چوارچێوەیەدا خەڵکی دەڤـەری کـەرکوك هـەوڵیان داوە ئـەو شـتومەکانەی کـە لـە خۆیـان زیـادە بینێرنـە دەرەوە و ئەوانـەش کـە شـارەکەیان پێویـستی پێیـەتی بـۆ نـاوخۆ هاوردەی بکەن. لە لایەکی تر دەتوانین بڵێین بایـەخی بازرگـانی کـەرکوك هۆیــەك بــوو بۆئــەوەی ببێتــە بازاڕێــك بــۆ فرۆشــتن و ســاغکردنەوەی بەرهەمی ئەم بەشەی کوردستان، وەك دواتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە.

لە سەدەی نۆزدەهەمدا بازرگانی یـەکێك لـەو لایەنـە گرنگانـە بـوو کـە بایەخی کەرکوکی تیادا بەدەرکەوت، ئەوەتا گەڕیدەی فەڕەنسی ئـۆتێر کـە دووجار لە ساڵانی (١٧٣٥-١٧٣٩ز)دا هاتۆتە شارەکە دەڵێت: "کەرکوك لە دوو بـەش پێکهـاتووە، بەشـی یەکـەم قەڵایـە کـە ژمارەیـەکی زۆر دانیـشتوانی شـارەکەی تێدایــە، بەشــی دووەمیــان ناوچــەی دەوروبــەری قەڵایــە، ئــەم

بەشەی دووەمیان سەنتەری بازرگانی شار پێك دەهێنێت"[١]. هەروەها گەڕیدەی جوولەکە بنیامین کە لە نێوان سالانی (١٨٤٦-١٨٥١ز)دا سەردانی کەرکوکی کردووە ئاماژە بەوە دەدات کە شاری کەرکوك بنکەی کارکردن و بازرگانییە[٢]. بەم شێوەیە ئەو گەڕیدانەی لە سەدەی هەژدەو نۆزدەدا هاتوونەتە کەرکوك گەواهی لەسەر چالاکی بازرگانی شارەکە دەدەن.

دیارە هەڵکەوتی جوگرافی کەرکوك ڕۆڵی کاریگەری هەبووە لەسەر چالاکی بازرگانی شارەکە، لەبەر ئەوەی کەرکوك تایبەتمەندی خۆی هەیە، بەو پێیەی شارەکە کەوتۆتە نێوان هەردوو هەرێمی شاخاوی و دەشتایی. ئەمەش بۆتە هۆیەك کە دەڤەری کەرکوك ببێتە خاڵی پێك گەیاندنی ئەم دوو هەرێمە[٣]. ئەم شوێنە ستراتیژیەی کەرکوك بووە هۆی ئەوەی شارەکە ببێتە سەنتەرێکی بازرگانی گەورە بۆ ئاڵوگۆڕ پێکردنی شتومەك و کەلوپەلی بازرگانی لەنێوان هەردوو هەرێمی چیایی و دەشتاییدا. ئەمەش وای کردبوو بزووتنەوەیەکی بازرگانی فراوان لەم شارەدا لە چاو شارەکانی تری هاوسێیدا دەربکەوێت[٤]. ئەوەتا (ریچ) گەواهی ئەوە دەدات کە کاروانە بازرگانییەکان ڕووەو کەرکوك نێردراون و تەواوی بەروبوومی ئەم بەشەی کوردستانی (مەبەستی کوردستانی باشوورە) بۆ چووە[٥]. ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کەرکوك ببێتە سەنتەری چالاکی بازرگانی لە دەڤەرەکەدا. هەر بۆیە شەمسەدین سامی بایەخ و بووژانەوەی بازرگانی کەرکوکی گەڕاندۆتەوە بۆ شوێنەکەی کە بۆتە هۆی ئەوەی چەندین ڕێگەی بازرگانی بێتەوە سەر شارەکە[٦]. لە لایەکی تر باری ئاوەدانی شاری کەرکوك لە سەدەی نۆزدەدا ڕۆڵی گرنگی هەبووە لە بووژانەوەی بازرگانی شارەکە، بە جۆرێك لە سەدەی ناوبراودا لە ناو شاری کەرکوکدا بازاڕێکی ناوخۆیی هەبوو کە (١٢٨٢) دوکانی لەخۆ گرتووە، ئەمە بێجگە لە بوونی ژمارەیەك کاروانسەراو گەرماو و شوێنی خزمەتگوزاری تر. لە لایەکی ترەوە لە ڕووی ژمارەی دانیشتوانەوە دەبینین شارەکە نزیکەی (٣٠٠٠٠) کەسی تێدا بووە، ئەمە بێجگە لە فرە نەتەوەیی شاری کەرکوك کە

دانیـشتوانەکەی لـە کـورد و تورکمـان و عـەرەب و جوولەکـە و کریـستیان پێکهاتبوو[٧]. بێگومان ئەمەش دەبووە هۆی ڕەنگاوبوونی شـار و بەشـداری کردنـی هـەموو ئـەم نەتەوانـە لـە پرۆسـەی بازرگانیـدا بـە جۆرێـك هەریەکەیان دەست ڕەنگینی خۆیان لە بوارێکدا بەدیار بخەن.

جێگەی باسە یـەکێکی تـر لـەو هۆکارانـەی کە کاریگـەری هـەبووە لەسـەر بایەخی بازرگانی شاری کەرکوك لە سەدەی نۆزدەدا ئەوە بوو کە ئەم شارە لەو سـەردەمەدا یـەکێك بـووە لـە شـارە گـەورەکانی باشـووری کوردسـتان. ئـەوەتا یەکێك لە گەڕیدەکان دوای ئەوەی لە ڕێگای موسـڵەوە دەگاتـە کـەرکوك دەڵـێ: "تـا ئێـستا کـەرکوك گـەورەترین شـارە لـە دەشـتایی ڕۆژهـەڵاتی دیجلـەدا"[٨]. بێگومان ئەمەش هۆکارێکی یارمەتیدەر بووە بۆ زیاتر ئاوەدان بوونی شارەکەو دواتـر پەرەسـەندنی بازرگـانی لـەو شـارەدا. هـەروەها چـەند هۆکـارێکی تـر کاریگەرییان لەسەر بایەخی بازرگانی شاری کەرکوك هەبووە، بەتایبـەتی ڕێگا بازرگانییەکان کە لێرە بەدوا باسیان دەکەین:

### أ- ڕێگا بازرگانییەکان:

ڕێگـا بازرگانییـەکان ڕۆڵـی کارایـان هـەبووە لـە پەرەسـەندنی کـەرکوك و دروستبوونی چالاکی بازرگانی لەگەڵ ناوچـەکانی دەوروبەریـدا. یـەکێك لـەو ڕێگـە بازرگانیانـەی کـە بـە کوردسـتاندا تێپـەڕیوەو هـەردوو شـاری بەغـدا و موسڵی بەیەکەوە بەستۆتەوە ڕێگەی ڕۆژهەڵاتی دیجلە بووە. ئەم ڕێگەیـە لـە بەغـداوە دەهـات و بـە هەریـەك لـە دەڵـی عـەباس و قـەرە تەپـەو کفـری تێدەپەڕی و پاشان بۆ خورماتوو و داقوق، دواتر لە کەرکوکەوە بەرەو پـردێ پاشان هـەولێر و لـە ڕێگـەی زێـی گـەورەوە دەگەیـشتەوە موسـڵ[٩]. هـەروەها هەنـدێ جـار کاروانـە بازرگانییـەکان بـە هـەولێردا تێنەدەپـەڕین بـەڵکو لـە ڕێگەی شـەمامکەوە دەچوونە زێـی گـەورەو لەوێـشەوە بـۆ موسـڵ[١٠]. لێـرەدا دەبینین ئەم ڕێگەیە وەك شادەمارێك وابـوو کـە چـەندین شـارو شارۆچـکەی ناوچـەکەی پێکـەوە گـرێ داوە. دیـارە ئـەم ڕێگەیـە لـە لایـەن گەڕیـدە بیانییـەکانیش پەسـەند بـووە، ئـەوەتا نیبـور لـەم بارەیـەوە دەڵێـت: "ئـەم

ڕێگەیە تەواو ئەمین و ئارامە، تا ئەو ڕادەیەی کە ئەگەر بەم ڕێگەیەدا سەفەربکەی پێویست ناکات چاوەڕوانی کاروانێکی گەورە بیت تا لەگەڵیدا بڕۆی. ئەمە بێجگە لەوەی لەم ڕێگەیەدا چەندین شارو ئاوەدانی دێنە پێش کە کاروانچی دەتوانێت لێیان لابدات و پشوویان تێدا بدات"[11].

هەر لەم ڕێگەیەوە دەڤەری کەرکوك بە هۆی پردی ئاڵتون کۆپری (پردێ) بە هەریەك لە هەولێر و موسڵەوە دەبەسترایەوە. ئەم ڕێگەیە لە کەرکوکەوە بەرەو پردێ و لەوێشەوە بەرەو قوشتەپە و هەولێر تێدەپەڕی، دواتر کاروانچی دەیتوانی لە هەولێرەوە بە ڕێگەی (کەڵەك)ەوە بچێتە شاری موسڵ[12]. شایەنی باسە زێی بچووك کە بە شارۆچکەی پردێ دا تێپەڕ دەبوو، هەندێ جار بەکاردەهات بۆ گواستنەوەی شتومەك و کەلوپەلی بازرگانی بۆ بەغدا لە ڕێگەی دیجلەوە هەروەها لە شاری کۆیەوە ڕێگایەك دەچوو بۆ کەرکوك[13]، دوای ئەوەی بە پردێدا تێدەپەڕی. بەڵام سەبارەت بە ڕێگەی بازرگانی نێوان کەرکوك و سلێمانی کە ئەم دوو شارە پەیوەندی بازرگانی بەتین لە نێوانیاندا هەبووە -کە لە داهاتوودا ڕوونی دەکەینەوە- ئەوا بازرگانانی کەرکوك بۆ گەیشتن بە سلێمانی سەرەتا دەچوونە شوان و لەوێشەوە بۆ دەربەندی بازیان و پاشان دەچوونە تاسلۆجە دواتر بۆ سلێمانی[14]. هەروەها پێویستە لێرەدا ئاماژە بە شوێنی ناوەندی شاری کەرکوك بدەین لە نێوان شارەکانی سلێمانی و هەولێرو موسڵ و بەعقوبەدا، هەر بۆیە شاری کەرکوك بەردەوام پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ ئەم شارانەدا هەبوو. بێگومان ئەم شوێنەی کە کەرکوك هەیبوو لە بواری بازرگانیدا ڕەنگی داوەتەوە، ئەوەتا بازرگانانی موسڵ بۆ گەیشتن بە سلێمانی ڕێگەی کەرکوك- سلێمانییان هەڵبژاردووە لە چاو ڕێگەی هەولێر- سلێمانی. ئەمەش لەبەر ئەوەی ڕێگەی نێوان هەولێر و سلێمانی زۆر دوور بووە[15].

لەم باسەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەوا شاری کەرکوك بە هۆی تۆڕێك لە ڕێگای بازرگانییەوە بە ناوچەکانی دەوروبەریەوە گرێدرابوو، ئەمەش

وای کردبوو ناوچە کوردیەکان بەیەکەوە بەستراوبن و چەند سەنتەرێکی بازرگانی لە شارە کوردیەکاندا دروست ببن لە نێوانیاندا کەرکوك[١٦]. شایەنی باسە سلێمانی یەکێك بووە لەو دەروازانەی کە یارمەتیدەر بووە بۆ گەیشتنی کەلوپەلی بازرگانی دەڤەری کەرکوك بۆ وڵاتی ئێران. کەلوپەلی بازرگانی دەڤەرەکە لە ڕێگەی دەشتی گەرمیانەوە بۆ سلێمانی ئنجا بۆ هەڵەبجە و دواتر کرماشان و سنە و زەهاو نێردراوە. یان هەندێ جار کاڵای بازرگانی کەرکوك بە هۆی ڕێگەی خانەقینەوە گەیشتۆتە کرماشان[١٧]. هەروەها ناوچەی کەرکوك لە ڕێگەی موسڵ و بەغداوە دەیتوانی پەیوەندی بە بەندەرەکانی دەریای ناوەڕاست و ئەستەمبوڵ و کەنداوی فارسی بکات[١٨].

### ب- هۆیەکانی گواستنەوە:

سەرچاوە مێژووییەکان بۆمان ڕوون دەکەنەوە کە هۆیەکانی گواستنەوە لەو سەردەمەدا سادەو ساکار بوون وە بە تایبەتی ئاژەڵ بەکارهێنراوە بۆ گواستنەوەو شتومەك و کاڵای بازرگانی. ئەوەتا بە گوێرەی زانیاریەکانی ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ (١٨٩٢ز) هۆیەکانی گواستنەوە لە سەنجەقی کەرکوك هێسترو بارگیرو گوێدرێژ (کەر) بوون لەگەڵ بەکارهێنانی وشتر[١٩]. هەروەها بە گوێرەی گوتەی نیبور گوێدرێژ یەکێك بووە لەو جۆرە ئاژەڵانەی کە لە لایەن خەڵکی ناوچەکەوە بەکارهێنراوە بۆ گواستنەوەی شتومەك و کەلوپەلەکان[٢٠].

جێگەی باسە لەو سەردەمەدا کاروانەکان لە کاروانی بچووك و کاروانی گەورە پێکدەهاتن، بەڵام هەر کاروانێك چەند بەشێکی سەرەکی لەخۆ دەگرت لەوانە سەرۆك کە سەرپەرشتی جووڵەو ڕۆیشتنی کاروانەکەی دەکردو پێی دەوترا (کاروان باشی). هەروەها چەند پیاوێکی تر لەناو کاروانــدا هەبوون کە خزمەتی کاروانەکەیان دەکرد، بە تایبەتی سەرپەرشتی ئالیکدانی گوێدرێژ و ئەسپەکان لەکاتی ڕۆیشتن و کاروان

خستندا كه پێیان دەوت جڵەوكێش (سائس). ئەمـە بێجگـە لـە بازرگـان و ڕێبـوار و ئـەو شـتومەك و كەلوپەلانـەی كـە كاروانەكـە لـەخۆی گرتبـوو. شایەنی باسە هەر كاروانێكیش چەند پاسەوان و سەربازی لەگەڵدا بوو بـۆ پاراستنی لە ڕێگەو بانەكاندا لە چەتەو ڕێگر[٢١].

دیـارە لـە ڕێگـا ئاوییـەكانیش (كەڵـەك) بـەكاردەهات، ئـەوەتا لـە زێی بچووك كە بە شارۆچكەی پردێدا تێپـەڕ دەبـوو، كەڵـەك بـەكاردەهات بـۆ گواستنـەوەی شتومەك و كەلوپەلی بازرگانی بۆ بەغدا لە ڕێگەی دیجلـەوە. هەروەها كەلوپـەلی بازرگـانی لـە ناوچـەی كۆیـەوە[٢٢] بـە هـۆی كەڵەكـەوە دەگەیشتە پردێ[٢٣]. شایانی باسە ئەم شارۆچكەیە ـ كە ناحیەیـەكی سـەر بـە كـەركوك بـوو - وێـستگەیەكی پۆسـتەو بروسـكە (تلغـراف) بـوو بـۆ گەیاندنی پەیام و نامەكان بۆ پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی[٢٤].

كەڵەك لە كۆمەڵێ هەمبانەی پڕ هەوا پێك دەهات كە بەیەكـەوە تونـد دەكران بە هۆی بـەكارهێنانی كۆمـەڵێك داری درێـژو كۆڵەگەیـەك. لەسـەر ئەم هەمبانانەش تەختە دار دادەنـران كـە بـەكاردەهێنران بـۆ بـاركردن و گواستنـەوەی شتومەك و كەلوپەلی بازرگانی لـە ڕێگـەی ئـاوەوە. وەهەنـدێ جارجێگـای هـەڵگرتن و بـاركردنی كەلوپەلـەكانیش لـە شـێوەی ژوورێـك دروست دەكران و سەریان دەگیرا، ئەمەش بە مەبەستی پاراستنی لە بـاران و تیشكی خۆر[٢٥]. ئەوەتا گەڕیـدە راوۆلـف كـە خـۆی سـەردانی ناوچـەكەی كردووە گەواهی ئەوە دەدات كـە لـە شارۆچـكەی پـردێ كەڵـەكیان دروسـت كردووە ئەمەش بە هۆی بەكارهێنانی كەوڵی بزن[٢٦].

### ج- ئەو هۆكارانەی كاریگەرییان لەسەر بازرگانی كەركوك هەبوو:

لەگـەڵ ئـەوەی كـە بازرگـانی كـەركوك لـە سـەدەی نـۆزدەدا تاڕادەیـەك گەشاوە بووە و چەندین هۆكارو پاڵنـەر كاریگـەرییان لـەم بـوارەدا هـەبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند هۆكارێك كاریگەری خراپیان لەسەر بازرگـانی كەركوك هەبوو لە سەدەی ناوبراودا.

له سەرەتادا پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە دواکەوتوویی هۆکارەکانی گواستنەوە کاریگەری بەسەر بازرگانی دەڤەری کەرکوکەوە هەبوو، ئەمەش لەبەر ئەوەی هۆکارەکانی گواستنەوە تەنها ئاژەڵ بوون. بێگومان ئەمەش یارمەتیدەر نەبوو بۆ پەرەسەندنی بازرگانی لە ناوچەکەدا بە شێوەیەکی بەرفراوان. بۆیە سالْنامەی (١٨٩٤ز) ئاماژە بەوە دەکات کە ئەگەر لە داهاتوودا هێڵی شەمەندەفەر بە کەرکوکدا تێپەڕبێت ئەو کات فراوانی بازرگانی و بەرزبوونەوەی ئاستی ئابووری کەرکوك زامن دەبێت.[٢٧]

یەکێکی تر لەو کێشانەی کە کاریگەری خراپی بەسەر بازرگانییەوە هەبوو ئەوە بوو کە لەو سەردەمەدا ڕێگەکان بەدەست کێشەی نەبوونی ئاسایش و هەبوونی ڕێگری و تالان و دزو جەردەوە دەیانناڵاند[٢٨]. هەر بۆیە بازرگانان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەم کێشەیە پێکەوە کاروانی بازرگانییان دروست دەکرد، خۆشیان پاسەوانییان لێ دەکرد یان پیاوانی چەکدار سەرپەرشتی جووڵەی کاروانەکانیان دەکرد بۆ پاراستنی شتومەك و گەشتیاران و گواستنەوەیان لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر. دیارە ناوچە کوردیەکانیش یەکێك بوون لەو ناوچانەی کە ئەم دیاردەیان تێدا بڵاو بوو[٢٩].

وادیارە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا دوای سەرهەڵدانی ئاژاوەی هۆزەکان، بە تایبەتی جووڵانەوەی هەمەوەندەکان دژ بە دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە دەڤەری کەرکوکدا. ئەم بارودۆخەش کاریگەری لەسەر ڕێگەو بانەکان هەبووە، ئەوەتا گەڕیدەیەکی هۆڵەندی کە خۆی هاتۆتە ناوچەی کەرکوك باسی نائارامی ئەو دەڤەرەمان بۆ دەکات و دەڵێت: "... ساڵانی ١٨٩٠-١٨٩١ هەموو ڕێگەکانی ئەم ناوچەیە گیرابوون، ئەو کاروان و پۆستەیەی کە دوو هەفتە جارێك لە بەغداوە دەهات ئەبوایە (١٢٠٠) جەندرمە بیانپارێزێ..."[٣٠]. بێگومان ئەمەش مانای ئەوپەڕی نائارامی ڕێگەو بانەکانی ئەو ناوچەیە دەگەیەنێت، هەر بۆیە گەڕیدەی ناوبراو لە

دیمـەنێکی تـردا لـە بـارەی دەسـتدرێژی ڕێگرەکـان بـۆ سـەر کاروانـە بازرگانییـەکان دەڵێـت: "کاتێـك لـە خورمـاتوو کەوتینـە ڕێ، دوای دوو کیلۆمەتر لە ڕۆیشتن هەواڵێکی دڵتەزێنمان بیست، کاروانێك لـە موسـڵەوە هاتبوو بەڵام چەتەو ڕێگـران هـەڵیانکوتابووە سـەریان و دوو کـەس و سـێ وشـتریان لـێ کوشـتبوون، هـەر بۆیـە کاتێـك کاروانـچییەکان دەسـتیان کردبووەوە جەندرمەکان گوێیان لە تەقە دەبێ و بە هاواریانـەوە دەچـن و ڕزگاریان دەکەن"[٣١].

جێگەی ئاماژەیە ئەو پردەی سەر زێی بـچووك کـە لـە پـردێ دروست کرابـوو یارمەتیـدەرێکی گـرنگ بـووە بـۆ بازرگـانی و پەڕینـەوەی کاروانـە بازرگانییەکان. بەڵام ئەو جۆرە پردانە کـەم و کورتیـان زۆر بـووە، ئـەوەتا گەڕیدەیەك لەم بارەیەوە دەڵێت: "... ساڵانە ئەم پردە نزمە چ زیانێك بە کـاروان و هاموشـۆکەران دەدات، چ زینـدەوەرو ئـاژەڵێکی تێـدا دەخنکـێ، لەبـەر ئـەوەی قـەراغ و لێـواری پردەکـە بـەرز نـین بـەزۆری وشـتر لێـوەی بەرئەبێتـە خـوارێ و لـە ئاوەکـەدا ئـەخنکێ، بـەڵام وڵاغـە بـەرزەکان بەدەگمـەن بەرئەبنـەوە، وەك بـۆم باسـکرا خـەڵکێکی زۆر بـە نووسـین و پێشنیار و ڕاسپاردەو داوایان لە کاربەدەستان کردووە هەردوو لای پردەکـە چـەند پێیـەك بڵنـد بکـەن، ئەمـەش تـەنها پـەنجا لـیرەی زێـڕی تێدەچـێ کەچی هەموو داواکاریەکی لـەم شـێوەیە پـشت گـوێ خـراوە"[٣٢]. بێگومـان ئـەوەش مانـای بایـەخ نـەدانی کاربەدەسـتانی عوسمـانی دەگەیـەنێت لـە دەڤـەری کـەرکوك بـەو ڕێگـەو پردانـەی کـە بایـەخی گرنگیـان بـۆ بـواری بازرگانی هەبووە.

یـەکێکی تـر لـەو کێـشانەی کـە کاریگـەری خراپـی بەسـەر بـواری بازرگانیەوە هەبوو، ئەوەبوو کە زۆرجار دەوڵەت و والیەکانی ویلایەتەکان بـە زۆرداری پارەیـان بـە قـەرز لـە بازرگانـەکان وەردەگـرت، ئەمـەش کاریگەری خراپی لەسەر بازرگانان دروست دەکرد، لەبـەر ئـەوەی زۆربـەی کات بازرگانان زۆر بـە زەحمـەت پارەکانیـان لـە دەوڵـەت وەردەگرتـەوە[٣٣].

دیاره ئەم هەڵسوکەوتانە لە پاڵ نەبوونی ئاسایش لە دەڤەرەکەدا پاڵی بە خەڵکی خاوەن سامان ناوە بۆ ئەوەی پارەکانیان بشارنەوەو لە هیچ پڕۆژەیەکدا نەیخەنە گەڕ. یەکێك لەو گەڕیدانەی کە خۆی سەردانی کەرکوکی کردووە وەسفی تێڕوانینی خەڵکی ئەم شارەمان بۆ دەکات دەربارەی پارەو بازرگانی کردن و دەڵێت: "بیرو بۆچوونی زاناو ئابووریناسان لە جێگەی خۆیدا بووە کە گوتوویانە لە وڵاتە هەژارەکاندا پارەو پووڵ و ماڵێکی نەختینەی زۆر بە دەست میللەت و خەڵکەوەیە، بەڵام بە شێوەیەك دەتوانرێ بە شاردنەوە لەناوبرێ، ئەو شتەی کە لە گەشتەکەمدا من بە چاوی خۆم بینیم ڕاستی ئەو بیروبۆچوونەی دەسەلماند"[٣٤]. ناوبراو لە دیمەنێکی تردا دەڵێت: "مرۆڤ دەپرسێ ئەمانە ئەم هەموو پارەیەیان بە چی پەیدا کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانە زۆر هەژارو دەست کورت دیار بوون کە هەروەك مشکی کڵێسا وابوون"[٣٥].

### دووەم/ پەیوەندییە بازرگانییەکان:

یەکێك لەو دیاردە ئابووریانەی کە لە دەڤەری کەرکوکدا بەدی دەکرێ لە سەدەی نۆزدەدا، بریتییە لە بازرگانی ناوخۆیی و دەرەکی. جێگەی باسە بازرگانی ناوخۆیی شارەکە لەو کڕین و فرۆشتنەی کە لە ناوخۆیی شارەکە ئەنجامدەدرا خۆی دەبینیەوە. بەڵام بازرگانی دەرەکی لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەریدا بەڕێوە دەچوو، بە تایبەتی لەگەڵ شارەکانی سلێمانی و موسڵ و بەغدا، ئەمەش بە مەبەستی ناردنە دەرەوەی ئەو شتومەك و کاڵایانەی کە لە پێداویستی ناوخۆی شارەکە زیادن و هێنانی ئەو کاڵایانەی کە بازاڕی ناوخۆی شارەکە پێویستی پێیەتی، وەك لە داهاتوودا ڕوونی دەکەینەوە.

#### أ- بازرگانی ناوخۆیی:

لە باسەکانی پێشەوە ئەوەمان ڕوون کردەوە کە کەرکوك بە هۆی چەندین ڕێگاوە پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ دەوروبەریدا هەبوو، بە هۆی

ئـەم ڕێگایانـە کـە کـەرکوکیان بـە دەرەوە دەبەسـتەوە دەیتـوانی بازرگـانی لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەریدا بکات. زۆربەی ئەو گەڕیدانەی هاتوونەتـە شـارەکە گـەواهی لەسـەر گـەرم و گـوڕی بـازاڕی نـاوخۆی کـەرکوك دەدەن، ئەوەتا یەکێك لەو گەڕیدانە لە بارەی بازاڕی ناوخۆیی کەرکوکەوە دەڵێت: "بەشـی دووەمـی شـاری کـەرکوك دەشـتاییە بـە دەوری قەڵاکەیـەوە کـە چـەندین کـاروان سـەرای سـەرەکی تێدایـە لەگـەڵ قاوەخانـەو بـازاڕ"[٣٦]. ئەمـەش بـۆ خـۆی گەواهییـەکی گرنگـە لەسـەر هـەبوونی بـازاڕی نـاوخۆ. هـەروەها ریـچ بـە شـێوەیەکی زۆر ئاشـکرا وەسـفی پێگـەی بازرگـانی کەرکوکمان بۆ دەکات و دەڵێـت: "... سـەبارەت بـە بـەروبوومی کوردسـتان زۆر دوایـن، شـاری کـەرکوك ئـەو بازاڕەیـە کـە هـەموو بـەروبوومی ئـەم بەشـەی کوردسـتانی.[مەبەسـتی میرنـشینی بابانـە] بـۆ دەبـردرێ"[٣٧]. وا دیـارە هۆکـاری ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ گرنگـی شـاری کـەرکوك لـە چـاو شـارەکانی تـری ئـەم بەشـەی کوردسـتان لـەو ڕۆژگـارەدا، بـە جۆرێـك ئـەو سەردەمە کەرکوك وەك پایتەختی ئەم بەشەی کوردستان وابوو. هەروەها پۆرتـەر کـە لـە سـاڵی (١٨٢٢ز)دا هاتۆتـە کـەرکوك سـەبارەت بـە بـازاڕی کەرکوك دەڵێت: "بازاڕی کەرکوك تەسکەو تاریکە بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا هەموو جۆرە پێداویستیەکی مرۆڤ لەو شارەدا دەست دەکەوێت"[٣٨]. ئەمـە سەرەڕای گەواهی گەڕیدەیەکی هۆڵەندی کە لە بارەی گەرم و گوڕی بازاڕی نـاوخۆی کەرکوکـەوە دەڵێـت: "دوکـان و بـازاڕ و چـایخانەو کـاروان سـەراو شـەقامەکانی کـەرکوك وا نیـشان دەدەن کـە لـەم شـارەدا کاروکاسـبی و بازرگانی و کڕین و فرۆشتنی گـەرم و گـوڕ لـە برەودایـە"[٣٩]. هـەروەها لـە ساڵنامەی ویلایەتی موسڵی (١٩١١-١٩١٢ز)دا هاتووە کە بازاڕی شاری کەرکوك بـەوە دەناسـرێ کـە بـازاڕێکی ڕێکوپێکی هەیـە[٤٠]. وە بـە پـێی ساڵنامەی هەمان ویلایـەت لـە سـاڵی (١٨٩٤ز) لـە شـاری کەرکوکـدا بـازاڕێکی نـاوخۆی گـەورە هـەبوو کـە بـریتی بـوو لـە (١٢٨٢) دوکـان و مـەغازەو یـەك بـازاڕی قەیسەری، ئەمـە بێجگـە لـە هـەبوونی ١٢ خـان[٤١]، (کـاروان سـەرا) کـە بـۆ بازرگانـانی دەرەوەی شـار ئامـادە دەکـران تـا لـەکاتی مانـەوەدا خۆیـان و

وڵاغـەكانیان تێـدا بحەوێنـەوە. لێـرەدا بۆمـان دەردەكـەوێت كـە شـاری كەركوك لە ناوخۆدا بازاڕێكی گەشاوەو گەرمی هەبوو كە بێگومان ئەمەش كاریگەری هەبووە لەسەر دروستبوونی بازرگانی لەگەڵ دەوروبەردا.

سەبارەت بەو شتومەك و بەرهەمانەی كە لە بازاڕی ناوخۆی كەركوكدا مامەڵەیان پێوە كراوە ئـەوا دەبیـنین لـە چـەندین شـتومەك و بەرهـەمی جیاجیـا خـۆی دەبینێتـەوە، ئـەوەتا بـە گـوێرەی گوتـەی گەڕیدەیـەكی ئینگلیـزی دوكـانی پـێڵاو فرۆشـی هـەبوو كـە پـێڵاوی بەغـدایی تێـدا دەفرۆشرا، هەروەها دوكانی كورتان فرۆش و گۆشت فرۆش هەبوون[٤٢].

هەروەها بەرهەمی ماسی یـەكێك بـووە لـەو بەرهەمانـەی كـە زۆربـەی كات لـە دەڤـەری كەركوكـدا هـەبووە، ئەمـەش بـە هـۆی تێپـەڕبوونی زێی بـچووك بـەو ناوچـەیەدا بـە تایبـەتی بـە شارۆچـكەی پـردێ دا. ئـەوەتا گەڕیدەیـەكی ئینگلیـزی كـە لـە ساڵی (١٧٥٨ز)دا بـە شارۆچـكەی پـردێ دا تێپەڕ بـووە، لـەم بارەیـەوە دەڵێـت: "ئـەم زێیـە ماسـی نایـابی تێدایـە كـە كێـــشی هەنـــدێكیان دەگاتـــە ٢٠٠ رەتـــڵ"[٤٣]. هـــەروەها مەســـەلەیەكی بەڵگەنەویستە كە لەپاڵ ئەمانە چەندین كاڵا و بەرهەمی تریش لـەبازاڕی كەركوكدا فرۆشراون، بەتایبەتی ئـەو بەروبوومـە كشتوكاڵی و ئاژەڵیانـەی كـە لەدەڤەرەكـەدا بەرهـەم دەهێنـران، وەك دانەوێڵـە و ئـاژەڵ و خـوری و هەنگوین و بەرهەمەكانی شیر.

شـایەنی باسـە تـەواوی كـاڵاو ئـەو بەرهەمانـەی لـە دەڤـەری كـەركوك دەنێردرانە دەرەوە لە بازاڕی نـاوخۆی شـارەكە زیـاد دەبـوون، بـە جۆرێـك لێرەدا دەتوانین بڵێین ئـەو شـتانەی دەنێردرانـە دەرەوە كـە لـە داهاتوودا باسیان دەكەین هەر ئەو شتومەك و بەرهەمانە بوون كە بـازاڕی نـاوخۆی كەركوكیان پێ گەرم كرابوو.

### ب- بازرگانی دەرەكی:

یەكێك لە ڕواڵەتەكانی بازرگانی كەركوك لە سەدەی نـۆزدەدا بازرگـانی دەرەوەیە، كە لەم چوارچێوەیەدا بەرهەمە زیادەكانی شـارەكە دەنێردرانـە

دەرەوە، بــە گــوێرەی زانیــاری (ئینیــسکلۆپیدیای بــەریتانی) لــە ســەدەی نــاوبراودا کــەرکوك بــەروبوومی کــشتوکاڵی و ئاژەڵــداری دەنــاردە دەرەوە ئەمەش وەکو شتومەکی چنراو و بەدەست دروست کراوەکان[٤٤]. لە لایەکی تــر کــەرکوك هــەوڵی داوە ئــەو شــتانەی کــە شــارەکە پێویــستی پێبــوو لــە دەرەوە وەریان بگرێت، لێرەشدا بازرگانی لەگەڵ بەغدا بایەخێکی تایبەتی هەبوو، چونکە ئەم شارە مەڵبەندێك بوو کە چەندین کەلوپەلی لـەدەرەوە بۆ دەهات، هەندێك لەو کالاّیانە وەك شەکرو ئاوریشم و جل و بەرگی دڕو نەرم لە ڕێگەی بازرگانەکانەوە دەهێنران بۆ کوردستان[٤٥]. بێگومـان دەبـێ کەرکوکیش بەشی خۆی لەم کالاّیانە لە بازرگانە بەغدادیەکان کڕیبێت بـە تایبەتی ئەو کالاّیانە بە کەرکوکدا تێدەپەڕین، لەبەر ئەوەی ئەم شتانە لە کەرکوك بەرهەم نەدەهێنران وە شـارەکەش پێویـستی پێیـان هـەبووە. بـە گوێرەی ساڵنامەی (١٩١١-١٩١٢ز)دا ئەو شـتومەك و پێداویـستیانە لـە ناوچـە کوردیەکاندا کڕدراون کە خۆیان نەیان دەتوانی بەرهەمی بهێنن کە بریتی بوون لە شەکر و قاوەو قوماش و ئاوریشم و هەندێ دروسـتکراوی هینـدی و چـەك و تەقەمـەنی[٤٦]. هـەروەها بـە گـوێرەی ئامـاژەی نیبـور دەڤـەری کەرکوك ژمارەیەکی زۆر ئاشی ئـاوی لێبـوو، هـەر بۆیـە ڕێژەیـەکی زۆر لـە بەرهـەمی ئـارد دەنێـردرا بـۆ بەغـدا و لـە بەرانبـەردا خورمـای بەسـرەو بەرهەمی تر دەهێنران[٤٧]. هـەروەها هەنـدێك لـە خـەڵکی هـەژاری بەغـدا ڤیریان دەکڕی کـە لـە ناوچـەکانی دەوروبـەری کـەرکوك دەردەهێنـرا و بـۆ ڕووناککردنــەوە بــەکاریان دەهێنــا[٤٨]. لــە لایــەکی تــرەوە لــە کەرکوکــەوە ئاوریمشی خاو دەنێـردرا بـۆ بەغـدا بـۆ ئـەوەی لـە کارگـەکانی ئـەو شـارەدا بەکاربهێنرێن بۆ دروستکردنی کوتاڵی ئاوریشم[٤٩]. لـە بەرانبـەردا خـەڵکی کــەرکوك قوماشــی لۆکــەو ڕاخــەری ناومالّیــان لــە بەغــدا وەرگرتــووە[٥٠]. هەروەها مێجەرسون کـە لـە ساڵی (١٩٠٧ز)دا هاتۆتـە کـەرکوك و ناوچـەکە ئاماژە بەوە دەکات کە بازرگانیکردن بە ئاوریشم و کوتـاڵی دروسـتکراو لـە لۆکە لە هەموو کوردستان و تەنانەت کەرکوکیش دەکرا[٥١].

لـه ڕاسـتیدا بازرگـانی شـاره کوردیـەکان تـەنها لەگـەڵ ناوچـەکانی دەوروبـەری خۆیانـدا نـەبووە، بـەڵکو کوردسـتان سەرچـاوەی چـەندین بـەروبوومی گرنگـی ئـاژەڵی و کـشتوکاڵی بـوو بـۆ ئەسـتەمبوڵ و شـام. ئەستەمبوڵ کە پایتـەختی دەوڵـەتی عوسمـانی بـوو ساڵانە نزیکـەی یـەك ملیۆن و نیـو ئـاژەڵی لـە مـەڕو بـزن و مانگا لـە ناوچە کوردیەکانـەوە بـۆ دەچوو. بەگشتی کوردستان ساڵانە نزیکەی سێ ملیۆن سەر ئاژەڵی دەنارده ئەسـتەمبوڵ و شـام و بەغـدا. وە نـەبێت ئـەو شـتومەکانەی لـە ناوچـە کوردیەکان لـە سـەدەی نـۆزدەدا دەنێردرایـە دەرەوە تـەنها سـامانی ئـاژەڵی بـووبن بـەڵکو سـامانی کـشتوکاڵی و سروشـتیش دەنێردرانـە دەرەوە، وەك خـوری و تـوتن و دار و هـەنگوین و سـەوزە و گـەنم و جـۆ و هـی تـر[٥٢]. بێگومان دەڤەری کەرکوکیش کە دەوڵەمەند بوو بە بەروبوومی کشتوکاڵی و ئاژەڵی دەبێ پشکی خۆی لەم هەناردانە بەرکەوتبێ، ئەوەتا بـە گـوێرەی زانیاریـەکانی (ئینـسایکلۆپیدیای ئیـسلام) شـاری کـەرکوك سـەنتەرێکی بازرگانی و بـازاڕێکی کـشتوکاڵی گـرنگ بـوو بـۆ گـەنم و جـۆو بـەروبوومی ئاژەڵی بۆ دەڤەری دەوروبەری[٥٣].

هـەر سـەبارەت بـە بازرگـانی دەرەکـی کـەرکوك دەبیـنین پەیوەنـدی بازرگانی لە نێوان کەرکوك و موسـڵ تاڕادەیـەکی بـاش گـەرم و گـوڕ بـووە، ئەمـەش بـە گـوێرەی زانیاریـەکانی سـاڵنامەی موسـڵی (١٩١١-١٩١٢ز)[٥٤]. بەتایبەتی کە شاری موسڵ بە هۆی ئەو شوێنە گرنگەی کە هەیبوو ببـووە بازاڕێك بۆ هەولێر و کەرکوك و سلێمانی و شـارەکانی تـری دەڤەرەکە[٥٥]. جێگەی ئاماژەیە پەیوەندی بازرگانی نێوان موسڵ و کـەرکوك تونـدو تـۆڵ بـوو بـە جۆرێـك لـە سـاڵانی کـەمی بـاران بـارین و نـەبوونی بـەروبوومی کشتوکاڵیدا موسڵ پشتی بە ناوچە کوردیەکانی تر دەبەست لـە نێوانیانـدا کەرکوك[٥٦].

جێگـەی باسـە کـە زۆربـەی گەڕیـدەو سەرچـاوە ڕەسمیـەکانی دەوڵـەتی عوسمانی جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کەوا شـاری کـەرکوك بـەروبوومێکی

زۆری کشتوکاڵی ناردۆتە دەرەوە. کە بێگومان ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم بەروبوومانە لە پێداویستی شارەکە زیاد بوونە، ئەوەتا گەڕیدە پۆرتەر ئاماژە بەوە دەکات کە بەرهەمی سەرەکی ئەم شارە گەنم و جۆیە، بەڵام برنج بە ڕێژەی کەمتر بەرهەم دەهێنرێت. ئەمە بێجگە لەوەی گەڕیدەی ناوبراو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە شاری کەرکوك بە بەرهەمهێنانی لۆکەش بە ناوبانگە و ئەوەی لە خۆی زیادە لەم بەرهەمە دەینێرێتە دەرەوە[٥٧]. هەر بۆیە لە سەدەی نۆزدەدا بەرهەمەکانی گەنم و جۆ دەنێردرانە دەرەوەی شار[٥٨]. هەروەها بە گوێرەی سالنامەی ویلایەتی بەغدای (١٨٧٧ز) هەناردەی کەرکوك لە بەروبوومە کشتوکاڵیەکاندا ڕێژەیەکی بەرزی تۆمار کردووە، بە جۆرێك لە ساڵی ناوبراودا ناوچەی کەرکوك (٦,٠٠٠,٠٠٠) ئۆقیە[٥٩] گەنم و (٢,٠٠٠,٠٠٠) ئۆقیە جۆو (١٣,٣٣٣) ئۆقیە نیسك و(٤,٤٥٠) ئۆقیە نۆك و (٤٠,٠٠٠) ئۆقیە مازووی ناردۆتە دەرەوە[٦٠]. بێگومان لێرەدا دەتوانین بڵێین هەریەك لە موسڵ و بەغدا پشکی خۆیان لەم هەناردانەی کەرکوك بەرکەوتووە، ئەمەش لەبەر ئەوەی زۆربەی پەیوەندی بازرگانی دەرەوەی کەرکوك سنوردار بووەو بەزۆری لەگەڵ بەغداو موسڵ و سلێمانیدا ئەنجام دەدرا[٦١]. هەروەها شوێنی کەرکوك و موسڵ کە لە نزیکی یەکتر بوون کاریگەرییان لەسەر بازرگانی یەکتر و ناوچەکەش هەبووە، ئەوەتا ئەو کاروانە بازرگانیانەی لە ئامێدی و دهۆك و موسڵەوە دەهاتن، دەچوون بۆ شارەکانی کەرکوك و هەولێرو دەڤەری شارەزوور[٦٢]. لە لایەکی ترەوە بازرگانانی دەڤەری بادینان لە ڕێگەی موسڵەوە پەیوەندی بازرگانییان لەگەڵ کەرکوکدا هەبووە، بە گوێرەی ڕاپۆرتی کونسوڵی ئەڵمانی لە ساڵی (١٩٠٧ز)دا بازرگانانی کەرکوك بایی (٩٠٠٠) لیرەی عوسمانی[٦٣] بەروبوومی جۆراوجۆریان لە بازرگانانی بادینان کڕیوە. بەڵام لە هەمان ساڵدا بازرگانانی دەڤەری بادینان بایی (٥٦,٠٠٠) لیرە لە بەروبوومی مەڕو خوری و پێستی ئاژەڵیان لە کەرکوك کڕیوە[٦٤].

شایەنی باسە ناوچە کوردییەکان لە ڕێگەی موسڵەوە هەندێ شتومەك و بەرهەمی ئەوروپییان پێگەیشتووە، کە بازرگانانی موسڵ لە ڕێگەی دەریای ناوەڕاستەوە بۆیان دەهات، لەوانە ئاسن و ڕاخەرەکان و عەبا[٦٥]. ئەمە بێجگە لەوەی هەندێ کەلوپەلی تری وەك شەکر و ئاوریشم و جلوبەرگی دڕو نەرم لە بازرگانانی بەغدا دەکڕان، کە بازرگانانی بەغداش لە ڕێگەی هیندستانەوە دەیانهێنا[٦٦]. هەروەها خەڵکی ناوچە کوردییەکان قاوەیان لە بەغدا وەردەگرت، کە ئەوانیش لە ناوچەکانی دەرەوە دەیانهێنا[٦٧]. هەروەها بە گوێرەی گوتەی گەڕیدە ئۆلیڤیە هەریەك لە بەغداو موسڵ و کەرکوك جۆرە ماددەیەکیان دەناردە دەرەوە بە ناوی (النیل) کە بۆ بۆیاغکردن بەکاردەهات[٦٨].

هەروەها کەرکوك لە سەدەی نۆزدەدا بازرگانی لەگەڵ شاری هەولێردا هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم شارە لە سەدەی نۆزدەدا لە چاو شارەکانی تری وەکو کەرکوك و سلێمانی بچووکتر بوو[٦٩]، بەڵام پەیوەندی بازرگانی لە نێوان هەولێرو کەرکوکدا هەبووە. کاتێك نیبور سەردانی ناوچەکەی کردووە دەڵێت: "ئەو کاروانەی لە کەرکوکەوە لەگەڵ ئێمە هات لە هەولێر سەفەرەکەی کۆتایی هات، دواتر دەڵێت: پاشان گوێمان لێ بوو دوای ئەمە کاروانێکی تریش هات لەگەڵ ئەم کاروانەی پێشووتردا یەکیان گرت"[٧٠]. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی بازرگانی کەرکوك لەگەڵ سلێمانی زۆر گەرم و گوڕترو فراوانتر بووە.

شاری سلێمانی یەکێك بووە لەو ناوچە کوردیانەی کە لە سەدەی نۆزدەدا پەیوەندی بازرگانی فراوانی لەگەڵ دەڤەری کەرکوکدا هەبوو، ریچ باسی بازرگانی نێوان کەرکوك و سلێمانیمان بۆ دەکات و دەڵێت: "کەرکوك ئەو بازاڕەیە، نەك هەر لە لایەن کوردەکانی دەرەوەی کەرکوکەوە، بەڵکو لە لایەن ئەو کەرکوکیانەشەوە کە بۆ ئەم مەبەستە ﴿کڕین و فرۆشتن﴾ بۆ سلێمانی دێن و پارەی پێشەکی بە جوتیارەکان دەدەن بۆ چەڵتووك و هەنگوین و شتی تر، ئەو مازووەی کە لە قەرەداغدا

بـه زۆری بەرهـەم دەهێنرێـت، ئـەم مـازووە بـۆ کـەرکوك و لەوێـشەوە بـۆ موسڵ دەنێردرێت"[71]. هەروەها نووسـەرێکیش باسـی ئـەوەمان بـۆ دەکـات کە پەیوەندی بازرگانی نێوان کەرکوك و سلێمانی هەردەم بـەهێزو زۆرتـر بـوو لـە چاو بازرگـانیکردن لەگـەڵ شاری موسـڵ[72]. هـەر بۆیـە بازرگـانی سـلێمانی بـەردەوام لەگـەڵ کەرکوکـدا لـە پەرەسـەندندا بـووە، ئـەوەتا بازرگانـانی سـلێمانی جـل و بـەرگیان لـە شـاری کەرکوکـەوە دەکـڕی، لـە بەرانبەریـشدا شـاری نـاوبراو بەروبوومـە کـشتوکاڵیەکانی وەکـو گـەنم و تووتن و سەوزە و بەروبوومی ئاژەڵی وەك مەڕو مانگاو هەنـدێ بەرهـەمی پیشەگەری دەستی وەك جاجم و بـەرماڵی نوێـژکردن دەنـاردە کـەرکوك و بەغـدا و موسـڵ[73]. هـەر بۆیـە دەبیـنین بەرهەمـەکانی تـووتن و کـەتیرەو مازوو و سابوون لەو بەرهەمە گرنگانە بوون کە دوای ئەوەی کـەرکوك لـە سـلێمانی وەری دەگـرت، لـە ڕێگـەی بازرگانیـەوە دەنێردرانـە بەغـدا[74]. هـەروەها بـە گـوێرەی گـەواهی ریـچ بازرگـانی نێـوان کـەرکوك و سـلێمانی هەمیشە بەردەوام بووە، ئەمەش لەبەر ئەوەی کەرکوك بازاڕێکی بە ڕەواج بـووە بـۆ ئـەم بەشـەی کوردسـتان، لـە شـاری سـلێمانیـیەوە بەرهەمـەکانی نیسك و نۆك و ماش و پاقلە و هەنگوین و تـرش و میـوەو بـرنـج و ڕۆن و لۆکـەو مـەڕومالآت و مـازوو بـۆ کـەرکوك دەنێـردراو لەوێـشەوە پـێلآو و هەندێ کوتاڵی لۆکەی ئەستوور دەهێنران[75].

یـەکێك لـەو لایەنـە گرنگانـەی کـە دەمێنێتـەوە لێـرەدا باسـی بکـەین بریتییە لە بەشداری دانیشتوانی جوولەکەو کریستیان لـە شـاری کـەرکوك لـە بـواری بازرگانیـدا ، سەرچـاوەیەکی مێـژوویی جـەخت لەسـەر ئـەوە دەکاتـەوە کـە جوولەکـەو کریـستیانەکانی شـاری کـەرکوك وەك چـینی بۆرژوازی شارەکە بـوون و ڕۆڵێکـی دیاریـان لـە بـواری بازرگانیـدا گێـڕاوە، ئەمە بێجگە لەوەی کە خاوەن موڵکی گەورە بوون[76]. هـەروەها سەرچـاوە مێژووییەکان جـەخت لەسـەر ئـەوە دەکەنـەوە کـە جوولەکـەکان دەسـتیان بەسـەر بازرگـانی نـاوەوەو دەرەوەی کەرکوکـدا گرتبـوو[77]. هـەر بۆیـە

دەبینین هەریەك لە بازرگانە کریستیان و کوردو تورکمانەکان بازرگانە بچووك و ناوەندییەکانیان پێك دەهێنا، بەڵام ئەمانیش ڕۆڵی زۆر کاریگەریان لە بازرگانی کەرکوکدا هەبوو[٧٨]. بێگومان فرەڕەنگی بوونی بازرگانان لە کەرکوکدا بە هۆی بوونی چەند نەتەوەیەك لە شارەکەدا هۆکارێك بووە بۆ بەهێزبوونی بازرگانی ناوەوەو دەرەوەی کەرکوك.

**سێیەم/ باج و ڕەسم و دراوەکان:**

**أ- باج و ڕەسم:**

شایەنی باسە دەسەڵاتدارانی عوسمانی بە شێوەیەك تەماشای ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان کردووە کە سەنتەرێکن بۆ کۆکردنەوەی باج، هەر بۆیە ئەوان پارەو پوولێکی زۆریان لە ڕێگەی باجەکانەوە کۆدەکردەوە[٧٩]. و ئەوان لە هەموو ئەو نەتەوەو تایەفانەی لەژێر دەستیان بوون باجیان وەردەگرت، زۆرجار ئەگەر کۆکردنەوەی باجەکان دوابکەوتنایە سزادانی توونديان پێڕەو دەکرد بە تایبەتی بەرانبەر جوتیاران[٨٠].

سەبارەت بە باج یان جۆری ئەو باجانەی کە دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی عوسمانی لە سەدەی نۆزدەدا لە ناوچەی کەرکوك وەریان گرتووە، ئەوا دەتوانین بڵێین ئەم ناوچەیەش وەکو ناوچەکانی تری ژێردەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی لە سیاسەتی باجگری ئەم دەوڵەتە بەدەر نەبوو. لەم چوارچێوەیەدا عوسمانییەکان چەندین جۆرە باج و ڕەسمیان لە خەڵکی ناوچەی کەرکوك وەرگرتووە[٨١]، بەڵام ئەوەی لێرەدا ئێمە مەبەستمانە تەنیا باجی بازرگانییە کە لێرە بەدوا باسی دەکەین:

دەوڵەتی عوسمانی چەندین جۆر باجی بەسەر بازرگاناندا سەپاندبوو، لەپێش هەموویاندا دەتوانین بڵێین باجی گومرگ بوو، ئەوەتا کاتێك کاروانێکی بازرگانی دەهاتە ناو شاری کەرکوك یان بە پێچەوانەوە کاربەدەستانی باجگری دەوڵەتی عوسمانی باجیان لێی وەردەگرت. بێگومان ئەم جۆرە باجە بە زۆری لە دەروازەی شارەکاندا وەردەگیرا.

گەڕیدە فرایزەر کە خۆی لە ساڵی (١٨٣٤ز)دا هاتۆتە کەرکوك لەم بارەیەوە دەڵێت: "کاتێك ئێمە گەیشتینە کەرکوك لە شوێنێکدا ئێمەیان ڕاگرت لەبەر ئەوەی لەو دەرگایەوە کاروانە بازرگانییەکانی کەرکوك دەردەچوون، هەر لەو جێگەیەشدا کارمەندانی دەوڵەت بڕی باج و ڕەسمی داواکراویان لێ وەردەگرتن[٨٢]. لە لایەکی تر یەکێکی تر لەو جۆرە باجانەی کە دەڵەتی عوسمانی لە بواری بازرگانیدا وەری دەگرت باجی پەڕینەوە بوو. ئەم جۆرە باجەش کاربەدەستانی عوسمانی کەرکوك لە پردێ لە بازرگانان وەریان دەگرت ، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە پردێ سەنتەرێکی بازرگانی و هەروەها کلیلی چەندین ڕێگەی تر بوو[٨٣]. ئەوەتا گەڕیدەیەکی هۆڵەندی کە لەسەدەی نۆزدەهەمدا سەردانی هەریەك لە کەرکوك و پردێی کردووە لەم بارەیەوە دەڵێت: "کاربەدەستانی عوسمانی ساڵانە ٨٠ هەزار مارك کرێی پەڕینەوە بەسەر پردی ئاڵتون کۆپری [پردێ] وەردەگرن"[٨٤]. هەروەها نیبوریش لە سەدەی هەژدەهەمدا باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە هیچ ڕێگەیەك ئەوەندە هەرزان و کەم تێچوو نییە لە ڕووی گومرگەوە بەقەد ڕێگەی کەرکوك _ پردێ- هەولێر، بەڵام بەو مەرجەی بازرگان بە ڕێگەی زێدا (زێی بچووکدا) بڕوات، کە کاربەدەستانی عوسمانی بڕێکی کەم پارەی لێ وەردەگرن بە ناوی باج[٨٥]. وە لەسەر ڕێگای نێوان کەرکوك و بەغداش لە یەکێك لە ڕێڕەوەکانی چیای حەمرین باجی پەڕینەوە وەردەگیرا، بەڵام ئەم شوێنە سەر بە بەغدا بوو نەك کەرکوك[٨٦].

بێجگە لەمانەی باسکران لەناو شاریشدا باجێکی تر لەسەر بازرگانی داندرابوو، ئەویش ئەو باجە بوو کە لەبازاڕەکاندا بەسەر دوکاندار و شوێنە بازرگانەکان سەپێنرابوو.[٨٧] وە هەندێ جاریش ڕێژەیەکی باجیان لەو کاڵایانە وەردەگرت کە لە بازاڕەکاندا بۆ فرۆشتن خرابوونە ڕوو. جێگەی سەرنجە قەبلاندنی ڕێژەی ئەم باج و پیتاکانە زۆر جار بنەمای دیاریکراوی نەبوو، چونکە هەندێ جار بەپێی کێشی کاڵا یان بەپێی ژمارە و قەبارە، هەندێ جاریش بەگوێرەی ئەو شوێنەی لێیەوە هاتووە دیاری دەکرا.[٨٨]

لێرەدا تەنیا ئەوە ماوە بڵێین ئەو باجەی کە دەوڵەتی عوسمانی لە کاتی هاتنەناوەوەی کەلوپەلی بازرگانیدا وەری دەگرت بۆ هەموو بازرگانان یەکسان نەبوو، بەڵکو بۆ بازرگانانی دەرەکی ٣٪ بوو لە کاتێکدا لە بازرگانانی ناوخۆ ڕێژەی ٧٪ یان ١٠٪ وەردەگیرا، ئەمە بێجگە لەوەی بازرگانانی بیانی یەك جار باجیان دەدا، بەلاَم بازرگانانی ناوخۆی دەوڵەتی عوسمانی چەندین جار باجیان لێ وەردەگیرا[٨٩]. ئاشکرایە ئەمەش بە هۆی ڕژێمی ئیمتیازاتەوە بوو کە دەوڵەتە بیانییەکان لە دەوڵەتی عوسمانیدا بەدەستیان هێنابوو.

**ب/ دراو و کێشان و پێوانە:**

پارە هۆیەکی گرنگی ئەنجامدانی ئاڵوگۆڕی بازرگانییە. لە دەوڵەتی عوسمانیدا دراو و پارەی بەکارهێنراو زوو دەگۆڕان و ئەمەش زۆر جار کێشەی بۆ خەڵك دروست دەکردو بە گوێرەی پێداویستی ئەوان نەبوو، هەروەها هەمەجۆری دراوەکان لە دەوڵەتی عوسمانیدا و بلاَوبوونەوەی هەندێ جۆری دیاریکراو لە هەر ناوچەیەکدا کێشەیەکی لەبەردەم ئاڵوگۆڕیدا دروست دەکرد[٩٠].

لە ماوەی سەدەی نۆزدەدا لە کەرکوك و ناوچەکانی دەوروبەردا چەندین جۆرە دراو بەکارهاتووە، لەوانە (قروش) کە دراوێکی زیوی بوو وە لە دراوە جێگیرەکانی دەوڵەتی عوسمانی بوو. ئەم دراوە یەکەم جار لە ساڵی (١٦٨٨ز)دا لێدرا، ئەمەش دوو جۆری هەبوو قروشی ساغ و قروشی چرووك (واتە خراپ)[٩١]. جێگەی سەرنجە نرخی یەك قروشی عوسمانی هاوتای ٩,٠٨ی فلسی عێراقی بوو کە لە هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا بەکاردەهات، بەلاَم نرخی یەك قروش یەکسان بوو بە نیو پێنسی ئینگلیزی[٩٢].

هەروەها (ئاقچە) ش یەکێك بوو لە دراوە زیوییەکانی دەوڵەتی عوسمانی، کە لە سەردەمی مەغۆلەکانیش بە کارهاتووەو

عوسمانییەکانیش بەکاریان هێناوە و پێی دەوترا ئاقچەی عوسمانی، بەهای ئەم دراوە دەیکردە چارەك مسقاڵی زێڕ[٩٣] ، دراوی ناوبراو بە ڕێژەی (٩٠٪) پێکهاتەکەی زیو بوو، بەڵام دواتر بە هۆی دابەزینی بەهاکەی لە ساڵی (١٨٢٧ز)دا لە لێدان وەستا[٩٤]، جێگەی ئاماژەیە کە ئاقچە لە هەندێك ویلایەتی دەوڵەتی عوسمانیدا پێی دەوترا فلوسی عوسمانی[٩٥].

جگە لەم دراوانە چەند دراوێکی تری زیوی لە دەوڵەتی عوسمانیدا بەکارهاتوون لەوانە چەرخی هەشتی[٩٦] و دراوی مەجیدی، ئەم دراوەی دوایی لە سەردەمی سوڵتان عەبدولمەجیدا (١٨٣٩-١٨٦١ز)دا لێدرا. سەبارەت بە بەهاکەی نرخی یەك مەجیدی (٢٠) قروش و نیو مەجیدی ١٠ قروش و چارەکە مەجیدیەك ٥ قروش بوو[٩٧]. هەروەها دراوی (پارە)ش یەکێك بوو لە دراوە زیوییەکانی دەوڵەتی عوسمانی، ئەم دراوە لە کەرکوك و ناوچەکەدا بەکارهاتووە، سەبارەت بە بەهاکەشی ئەوا (١٠) پارە بەرانبەر بوو لەگەڵ یەك قروشی خراپ و (٥) پارەش دەیکرد نیو قروش[٩٨]. هەروەها دراوی فلوسی مسی یەکێك بووە لەو دراوە عوسمانییانەی کە لە دەڤەری کەرکوکدا بەکارهاتووە. سەبارەت بە بەهای ئەم دراوە لە کۆتایی سەدەی حەڤدەدا ئەوا نرخی (٥) فلوس دەیکردە یەك پارە[٩٩].

سەبارەت بەدراوی زێڕی بەکارهاتوو لە دەوڵەتی عوسمانیدا دەتوانین بڵێین لیرەی زێڕ لە هەموویان گرنگتر بوو. ئەم دراوە لە کەرکوك و ناوچەکە بەکارهاتووە، دەربارەی نرخەکەشی یەك لیرەی زێڕ دەیکرد (١٠٠) قروش[١٠٠]. هەروەها چەند جۆرە دراوێکی تری زێڕ لە ویلایەتەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا بەکارهاتوون لەوانە زر ئەستەمبوڵ و زنجیرلی و ڕۆمی[١٠١]. شایەنی ئاماژە بۆکردنە کەوا بەکارهێنانی دراوی تورکی لە کوردستاندا لە چوارچێوەیەکی فراوان نەبووە و بەتایبەتی خەڵکی ناوچەکە مامەڵەیان بە ڕێگەی ئاڵوگۆڕی شمەکیش (المقایضة) کردووە، نیبور لەم بارەیەوە دەڵێت: "ویستم ماوەی دانیشتنم لە موسڵ

به هەل وەربگرم، دەستم کرد بە گەڕان بەدوای بوونی دراوی ڕۆمانی و یۆنانی و فارسی، بەڵام خەڵکی جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە دەتوانیت لە ناوچەی کوردستان ئەم جۆرە دراوانەت دەست بکەوێت لەبەر ئەوەی لەو ناوچانەدا دراوی تورکی بەکەمی بەکاردەهێنرێت"[١٠٢]. شایەنی باسە لە ناوچە کوردییەکاندا بێجگە لە دراوی عوسمانی دراوی فارسیش بەکارهاتووە[١٠٣].

سەبارەت بە یەکەکانی کێشان و پێوانە کردن لە دەوڵەتی عوسمانیدا دەتوانین بڵێین ئەم یەکانە جێگیر نەبوون، بەڵکو لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر دەگۆڕان[١٠٤]. سەبارەت بە دەڤەری کەرکوك لەم ماوەیەدا یەکەی کێشان و پێوانەکان بەم شێوەیەی لای خوارەوە بوون:

- حۆقەی کەرکوك = ٥٦٦گرام ، ٢ کیلۆ = ٥,٦٥٣٦ باوەند.
- باتمان = $\frac{1}{2}$ ٦ حۆقەی کەرکوك.
- تەغاریٚ گەنم = ٥٠٠,٣٥٠ کیلۆگرام = ١١٠٢,٤٠٥ باوەند.
- تەغار جۆ = ٣٨٤,٨٨٣ کیلۆگرام = ٤٨٨ باوەند.

بۆ فرۆشتنی نەوت جەرەی ئاو کە پیٚی دەوترا جەرەی لەیلان (لیلان جەرەسی) بەکاردەهات کە دەیکرد نزیکەی ٤ گالۆن[١٠٥]. هەروەها پێوانەی باڵ بەکاردەهات بۆ پێوانەکردنی درێژی، ئەمەش بە زۆری بۆ پێوانەکردنی قوماش بەکاردەهات کە درێژییەکەی لە (٦٥)سم زیاتر نەبوو[١٠٦]، هەروەها فەرسەخیش[١٠٧] بەکاردەهات بۆ پێوانەکردنی زەوی و دوورییەکان، بە جۆرێك یەك فەرسەخ بە پێوانەی ئێستا دەکاتە نزیکەی شەش کیلۆمەتر[١٠٨].

## دەرەنجامەکان

١- زۆربەی ئەو گەڕیدانەی لە سەدەی نۆزدەهەمدا سەردانی ناوچەکەیان کردووە ئاماژە بەوە دەکەن کە کەرکوك مەڵبەندی کارکردن و بازرگانی بووە. دیارە شوێنی شارەکە ڕۆڵی هەبووە لەم بارەیەوە، بەتایبەتی کە خاڵی بەیەك گەیاندنی هەردوو هەرێمی شاخاوی و دەشتایی بووە و لەئەنجامیشدا ببووە ناوەندی ئاڵوگۆڕی شتومەکی هەردوو هەرێم.

٢- هەر ئەم شوێنە وای کردبوو چەندین ڕێگەی بازرگانی بەکەرکوکدا تێپەڕێت، کە گرنگترینیان ڕێگای (بەغدا- کەرکوك-هەولێر-موسڵ) بوو کە ئەمەش بەشێك بوو لەڕێگایەکی سەرەکی نێوان کەنداوی فارس و ئەستانبوڵ یان کەنداو و دەریای سپی. هەروەها ڕێگایەکی تریش لەکەرکوکەوە دەردەچوو بۆ سلێمانی و لەوێشەوە بۆ ئێران.

٣- لەپاڵ ئەمانە هەندێ هۆکار کاریگەری خراپیان هەبوو لەسەر بازرگانی کەرکوك لەم ماوەیەدا. وەك خراپی ڕێگا و بانەکان و دواکەوتوویی هۆیەکانی گواستنەوە. هەروەها بارودۆخی ناسەقامگیری ناوچەکە و نەبوونی ئاسایش لەڕێگا بازرگانییەکان هەندێ جار بازرگانییان تووشی کێشە و کۆسپ و تەگەرە دەکرد. سەرباری ئەمانە هەندێ دەسەڵاتدارانی عوسمانیش بەسیاسەتە چەوتەکانیان کاریگەری نەرێییان هەبوو لەم بوارەدا.

٤- شاری کەرکوك بازاڕێکی ناوەخۆیی ئاوەدانی هەبوو، بەجۆرێك لەساڵی ١٨٩٤ دا (١٣٨٢) دوکان و مەغازەی لەخۆ دەگرت. بۆیە سەودا و کڕینی جۆرەها کالاّ لەم بازاڕەدا گەرم بوو.

٥- هەروەها بازرگانی دەڤەری کەرکوك لەگەڵ هەرێم و ناوچەکانی دەوروبەریشی لەئاستێکی باش دابوو. لەڕێی موسڵ و بەغداوە چەندین جۆر کالاّی دەست دەکەوت، بەتایبەتی شەکر و قاوە و کوتاڵ و ڕایەخ و چەك و ئاسن و هەندێ دروستکراوی هیندی و ئەورووپی. هەر لەم دوو ڕێگەیەوە چەندین جۆری کالاّی ناردۆتە دەرەوە. بەتایبەتی بەروبوومی کشتوکاڵی و ئاژەڵی . بێگومان بازرگانانی کەرکوك ئاڵوگۆڕی بازرگانییان لەگەڵ ناوچە کوردییەکانی دەوروبەریشیان هەبوو بەتایبەتی سلێمانی و هەولێر.

٦- دەوڵەت چەندین جۆری باج و پیتاکی سەپاندبووە سەر بازرگانی، بەتایبەتی لە دەروازەی شارەکاندا ڕێژەیەکی باجی وەردەگرت. هەروەها باجی تێپەڕبوونیشی لەهەندێ شوێنی دیاریکراودا دەسەند. بەلاّم بازرگانانی بیانی ڕێژەیەکی کەمتری باجیان لێ وەردەگیرا لەچاو بازرگانانی خۆماڵی.

٧- چەندین جۆری دراو و هەروەها کێشان و پێوانە لەو ماوەیەدا لە دەڤەرەکە بەکاردەهێنرا، لە دراوە زیوەکان (ئاقچە) و (قروش) و لە زێڕەکانیش (لیرە) لە هەموویان زۆرتر بەکار هاتوون.

## پەراوێزەکان

(١) ج. اوتير، رحلة إلى تركيا وبلاد فارس، (باريس: ١٧٤٨)، ص١٥٠؛ نقلا عن: د.هلكوت حكيم، كركوك في كتابات الرحالة الفرنسيين، بحث ضمن كتاب: كركوك مدينة القوميات المتآخية، وقائع الندوة العلمية التي عقدها مركز كربلاء للبحوث والدراسات في لندن من ٢١-٢٢ تموز (يوليو) ٢٠٠١م، ط١، طبع في لندن: ٢٠٠٢، ص١٤٣.

(2) .Benjamin II, Qinqueannees de voyages in orlient,1846-1851,paris, p.78-79.

نقلاً عن: د. نرمين امين، كركوك/ الشواهد والمواقع القرن (١٨-١٩), بحث ضمن كتاب: كركوك مدينة القوميات المتآخية،ص٦٢٩.

(٣) شاكر خصباك، العراق الشمالي/ دراسة لنواحيه الطبيعية والبشرية، مطبعة شفيق، (بغداد ١٩٧٣)، ص٩١.

(٤) عمر ياسين الجباري، الاهمية التاريخية والجغرافية لمدينة كركوك وأثرهما على القيم الانسانية السائدة بين ابنائها، بحث ضمن كتاب: كركوك مدينة القوميات المتآخية، ص٦٩.

(٥) کلۆدیوس جێمس ریچ، گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، و: محەمەد حەمە باقی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، (هەولێر ٢٠٠٢)، ص١٤٢.

(٦) شمس الدين سامي، قاموس الاعلام، مجلد (٥)، مهران مطبعه سي، استانبول ١٣١٤ رومي/ ١٨٩٦م، ص٣٨٤٦.

(٧) بڕوانە: م.ن، ص٣٨٤٦؛ سالنامهٔ ولايت موصل (١٣١٢هـ)، موصل ولايتي مطبعه سنده باصلمشدر، ص٢٩٨-٢٩٩.

(٨) جيمس بكنغهام، رحلتي إلى العراق ١٨١٦، ت: سليم طه التكريتي، ج١، مطبعة اسعد، (بغداد ١٩٦٨)، ص١٤٤.

(٩) بڕوانه: محمد بن احمد الحسيني المنشيء البغدادي، رحلة المنشيء البغدادي، ترجمه عن الفارسية: المحامي عباس العزاوي، دار الجاحظ، (بغداد ١٩٧٠)، ص٥٠.

(١٠) ستيڤن هيمسلى لونگريك: اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ت: جعفر الخياط، (بيروت ٢٠٠٤)، ص١٥.

(١١) كارستن نيبور، رحلة نيبور إلى العراق في القرن الثامن عشر، ت: د. محمود امين حسين، مراجعة وتعليق: سالم الآلوسي، (بغداد ١٩٦٥)، ص٨١.

(١٢) بڕوانه: باروْن ئێدوارد نۆڵده، گەشتێك به عەرەبستان و كوردستان و ئەرمەنستاندا، وەرگێڕانى له ئەڵمانييەوە: حەميد عەزيز، چاپخانەى وەزارەتى ڕۆشنبيرى، (هەولێر ٢٠٠٤)، ل٣٠-٣١؛ ستيڤن لونگريك، اربعه قرون...، ص١٥، هەروەها بڕوانه: نيبور، م.س، ص٩١-٩٥.

(١٣) بۆ زانيارى لەم بارەيەوە بڕوانه: كلۆديوس جێمس ريچ، س.پ، ل٣٠٤-٣٠٥.

(١٤) هـ.س، ل٢٩٧-٣٠١؛ هەروەها بڕوانه: المنشيء البغدادي، م.س، ص٦٥.

(١٥) محمد عبدالله عمر، الامن القومي الكوردي لاراضي محافظة كركوك الزراعية، گۆڤارى (هاوارى كەركوك)، ع١، (اربيل ١٩٩٨)، ص١٣٩-١٤٠.

(١٦) بڕوانه: ماجد عبدالرضا، المسألة الكردية في العراق إلى ١٩٦١، مطبعة دار الجاحظ، (بغداد ١٩٧٠)، ص٢٦.

(١٧) عماد عبدالسلام رؤوف، الموصل في العهد العثماني/ فترة الحكم المحلي ١١٣٩-١٢٤٩هـ/١٧٢٦-١٨٣٤م، مطبعة الآداب النجف الاشرف ١٩٧٥، ص٢٩٨؛ عبدالعزيز سليمان نوار، داود باشا والي بغداد، دار العربي للطباعة والنشر، (القاهرة ١٩٦٨)، ص٢٨٨.

(١٨) د. سعدي عثمان حسين، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر/ دراسة في علاقتها الادارية والسياسية والاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل، مطبعة سيما، (السليمانية: ٢٠٠٦)، ص٣٥٧.

(١٩) سالنامۀ ولايت موصل (١٣١٠هـ)، مكتوبي ولايت سعادتلو حسن توفيق افندي معرفتيلە ترتيب اولنمشدر، ص٢٠٦؛ موصل ولايتي سالنامۀ رسميسيدر(١٣٢٥هـ)، عزتلو صفوت بك معرفتيلة ترتيب و دردنجي دفعة اولة رق موصل مطبعه سندة اولنمشدر.، ص٢١٤.

(٢٠) رحلة نيبور ....، ص٨١.

(٢١) سعدي عثمان، كوردستان الجنوبية...، ص٣٦١.

(٢٢) بێگومان مەبەست خودی شاری كۆیە نییە بەڵكو ناوچەكەیە، دیارە كەلوپولی ناوچەكە لە (تەق تەق) كۆكراوەتەوە ئنجا لەرێگای زێی بچووكەوە بە كەڵەك دەنێردرا بۆ پردێ.

(٢٣) بڕوانە: كلودیوس جیمس ریچ، س. ث، ل٣٠٤-٣٠٥.

(٢٤) سالنامۀ ولایت موصل (١٣١٢هـ)، ص١٦١.

(٢٥) سعدي عثمان، كوردستان الجنوبية...، ص٣٦١.

(٢٦) بڕوانە: ليونهارت راوولف، رحلة المشرق إلى العراق وسوريا ولبنان وفلسطين ١٥٧٣، ترجمة وتعليق: سليم طه التكريتي، دار الحرية للطباعة والنشر، (بغداد: ١٩٧٨).، ص١٩٩.

(٢٧) سالنامۀ ولایت موصل (١٣١٢هـ)، ص٣٠٢؛ هەروەها بڕوانە: سالنامۀ ولایت موصل (١٣٢٥هـ)، ص٢١٤.

(٢٨) بڕوانە: لوتسكي، تاريخ الاقطار العربية الحديث، ت: عفيفة البسياني، دار الفارابي، ط٧، (بيروت ١٩٨٠)، ص٢٣؛ بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: بابەتەكانی (هۆزی هەمەوەند و دەوڵەتی عوسمانی)و (كێشەی نێوان هۆزەكان) لە: بەختیار سەعید مەحمود شوانی، كەركوك لە سەدەی نۆزدەهەمدا/ لێكۆڵینەوەیك لە بارودۆخی ڕامیاری و ئابووری، نامەی ماستەر، كۆلێژی ئەدەبیات/ زانكۆی سەلاحەدین ـ هەولێر ٢٠٠٨، ل٥٦ و دواتر.

(٢٩) بڕوانە: عبدربة سكران الوائلي، أكراد العراق (١٨٥١-١٩١٤)/ دراسة في التاريخ الاقتصادي والاجتماعي والسياسي ، جامعة القاهرة- كلية الآداب، ١٩٨٧، ص٦٠؛ بارۆن ئێدوارد نۆڵدە، س.پ، ل٨ و دواتر.

(٣٠) بڕوانە: بارۆن ئیدوارد نۆڵدە، س.پ، ل١٤.

(٣١) ە. س، ل٢٣ و دواتر.

(٣٢) ە. س، ل٣٠-٣١.

(٣٣) طارق نافع الحمداني، ملامح سياسية وحضارية في تاريخ العراق الحديث والمعاصر، ط١، دار العربية للمسوعات، (بيروت ١٩٨٩)، ص١٣٩.

(٣٤) بارۆن ئێدوارد نۆڵدە، س.پ، ل٢٠.

(٣٥) هـ.س، ل٢٠.

(٣٦) جمس بكنغهام، م.س، ص١٤٢.

(٣٧) گەشتنامەی ریچ...، ل١٤٢.

(٣٨) وەرگیراوە لە: د. بدرخان السندي، المجتمع الكردي من المنظور الاستشراقي، ط١، مطبعة وزارة التربية، (أربيل ٢٠٠٢).، ص٤٩١.

(٣٩) بارۆن ئێدوارد نۆلدە، س. پ، ل٢٩.

(٤٠) موصل ولايتي سالنامۀ رسميسيدر (١٣٣٠هـ)، عزتلو صفوت بك معرفتيلة ترتيب و دردنجي دفعة اولة رق موصل مطبعة سندة اولنمشدر، ص٢٤١-٢٤٤.

(٤١) سالنامۀ ولايت موصل (١٣١٢هـ)، ص ٢٩٨-٢٩٩؛ هەروەها بڕوانە: شمس الدين سامي، م.س، مج٥، ص٣٨٤٦.

(٤٢) بڕوانە: ميجرسون، رحلة متنكر إلى بلاد مابين النهرين وكردستان، ترجمة: فؤاد جميل، ط١،(بغداد ١٩٧٠)، ج١، ص١٦٠، ١٧٥-١٧٦، ج٢، ص١٠٨-١٠٩.

(٤٣) بڕوانە: د. سەعدی عوسمان (وەرگێڕان و پەراوێز بۆ نووسین)، گەشتی دکتۆر ئێڤز بە کوردستاندا، گۆڤاری (مەتین) ژ١١٩، (دهۆك ٢٠٠١) ، ل١٣.

(44) . The new Encyclopedia Britannica, vol.v, USA 1977, p.834.

(٤٥) بڕوانە: جيمس ريموند ولستيد، رحلة إلى بغداد في عهد الوالي داود باشا، ت: سليم طه التكريتي، مطبعة ثويني، (بغداد ١٩٨٤)، ص٩٨.

(٤٦) سالنامۀ ولايت موصل (١٣٣٠هـ)، ص٩١؛ اوليفية، رحلة اوليفية إلى العراق (١٧٩٤-١٧٩٦م)، ت: د. يوسف حبى، مطبعة المجمع العلمي العراقي، (بغداد ١٩٨٨)، ص١٧٠.

(٤٧) رحلة نيبور...، ص٨٦.

(٤٨) بڕوانە: اوليفية، م.س، ص١٥٨.

(٤٩) م.ن، ص١٧٧.

(٥٠) م.ن، ص١٧٧.

(٥١) رحلة متنكر...، ج١، ص١٦٣.

(٥٢) ستيڤن هيمسلى لونگريك: العراق الحديث من (١٩٠٠-١٩٥٠)/ التاريخ السياسي والاجتماعي والاقتصادي، ت: سليم طه التكريتي، ج١، ط١، مطبعة حسام، (بغداد ١٩٨٨)، ص٥٧-٥٨؛ أ. م. منتشاشفيلي، العراق في سنوات الانتداب البريطاني، ت: هاشم صالح التكريتي، مطبعة بغداد، (بغداد ١٩٧٨)، ص٩٧-٩٨؛ عبد ربه سكران الوائلي، م.س، ص٦١.

(53) E.J. Brill, The Encyclopedia of Islam, New Edition, 1986, vol. 5, Art (Kirkuk),p.146.

(٥٤) سالنامۀ ولايت موصل (١٣٣٠هـ)، ص٢٤٦.

(٥٥) سالنامة ولايت موصل (١٣٣٠هـ)، ص٢٤٦.

(٥٦) بڕوانە: ياسين افندي العمري ابن خيرالله الخطيب الموصلي: زبدة الاثار الجلية في الحوادث الارضية، حققه وعلق عليه: د. عماد عبدالسلام رؤوف، مطبعة الاداب، (النجف الاشرف ١٩٧٤)، ص١٧.

(٥٧) وەرگیراوە لە: بدرخان السندي، م.س، ص٤٩٢.

(٥٨) سالنامة ولايت موصل (١٣١٠هـ)، ص٢٠٦.

(٥٩) بەپێی پێوانەی ئەو سەردەم یەك ئۆقیە دەیكردە (٢كیلۆ و ٥٦٦گرام). بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: بابەتی (دراو و كێشان و پێوانە) لەم توێژینەوەیەدا.

(٦٠) سالنامة ولايت بغداد (١٢٩٤هـ)، ص٣٠٣، نقلاً عن: د. عبدالفتاح علي البوتاني، دراسات ومباحث في تاريخ الكورد والعراق المعاصر، مطبعة حاجي هاشم، (اربيل ٢٠٠٧)، ص١١١.

(٦١) بڕوانە: سالنامة ولايت موصل (١٣٢٥هـ)، ص٢١٤؛ سالنامة ولايت موصل (١٣٣٠هـ)، ص٢٤٦.

(٦٢) بڕوانە: اوليفية، م.س، ص٦٢.

(٦٣) بۆ زانیاری لە بارەی ئەم جۆرە دراوە بڕوانە: بابەتی (دراو و كێشان و پێوانە) لەم توێژینەوەیەدا.

(٦٤) وەرگیراوە لە: كاميران عبدالصمد أحمد الدوسكي، بهدينان في أواخر العهد العثماني (١٨٧٦-١٩١٤)، ط١، مؤسسة موكرياني - اربيل، مطبعة خاني (دهوك ٢٠٠٧)، ص٣٦١.

(٦٥) سعدي عثمان، كوردستان الجنوبية...، ص٣٨٢.

(٦٦) جيمس ولستيد، م.س، ص٩٨؛ هەروەها بڕوانە: سعدي عثمان، كوردستان الجنوبية...، ص٣٨١.

(٦٧) رحلة اوليفية...، ص١٧٠.

(٦٨) م. ن، ص١٦٦.

(٦٩) د. عبدالجبار قادر غفور، أربيل في السالنامات العثمانية، مجلة (كاروان) ،ع٩١، ١٩٩٠، ص١٢٢.

(٧٠) رحلة نيبور...، ص٩١.

(٧١) گەشتنامەی ریچ...، ص١٤٢-١٤٣.

(٧٢) جمال بابان، سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ب٤، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، (سلێمانی ٢٠٠٢)، ل١١١.

(٧٣) سالنامۀ ولايت موصل (١٣٠٨هـ)، مكتوبي ولايت سعادتلو حسن توفيق افندي معرفتيلة ترتيب اولنمشدر ، ص١٤٩-١٥٠؛ سالنامۀ ولايت موصل (١٣١٠هـ)، ص٢٢٤-٢٢٥.

(٧٤) مامۆستا جەعفەر، شاری سلێمانی/ ململانێی گروپە کۆمەڵایەتییەکان (١٨٢٠-١٩٢٠)، چاپخانەی شڤان، (سلێمانی ٢٠٠٦)، ل١٦٦-١٦٧.

(٧٥) گەشتنامەی ریچ...، ل٢٧٨.

(٧٦) أ. م. منتشاشفيلي، م. س، ص٩٠.

(٧٧) عبد ربه سكران الوائلي، م. س، ص ١٣٠؛ نمير طه ياسين، بدايات التحديث في العراق ١٨٦٩-١٩١٤، رسالة ماجستير، جامعة المستنصرية، ١٩٨٤، ص٢٢؛

د. كمال مظهر أحمد، كركوك وتوابعها حكم التأريخ والضمير/ دراسة وثائقية عن القضية الكردية في العراق، ج١، مطبعة رينوين، د.ت ، ص٥٧.

(٧٨) كمال مظهر أحمد، م. س، ص٥٧.

(٧٩) د. طارق نافع الحمداني، م. س، ص١٣٨.

(٨٠) بڕوانە: د. جەلیل جەلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، وەرگێڕانی لە ڕووسییەوە: د. کاوس قەفتان، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، (بەغدا ١٩٨٧)، ل٦٧. بۆ زانیاری لەبارەی هەندێ لەو باجە جۆراوجۆرانەی کە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا وەرگیراون بڕوانە: عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، مج٧، مطبعة شركة التجارة والطباعة المحدودة، (بغداد ١٩٤٩). ص٢٧٨-٢٨٠. وعباس العزاوي، تاريخ الضرائب العراقية من صدر الاسلام إلى آخر العهد العثماني، مطبعة شركة التجارة والطباعة، (بغداد ١٩٥٩)، ص١١٣-١١٤.

(٨١) سەبارەت بە جۆر و ڕێژەی ئەو باجانەی کە لەو ماوەیەدا لە کەرکوك وەرگیراوە بڕوانە: بەختیار سەعید شوانی، س.پ، ل١٢٢–١٢٩.

(٨٢) جيمس بيللي فريزر، رحلة فريزر إلى بغداد في ١٨٣٤، ت: جعفر الخياط، ط١، مطبعة المعارف، (بغداد ١٩٦٤)، ص٧٢.

(٨٣) لەم بارەیەوە بڕوانە: نیبور، م.س، ص٧٥.

(٨٤) بارۆن ئێدوارد نۆڵدە، س.پ، ل٣١.

(٨٥) رحلة نيبور...، ص١٠١.

(٨٦) عباس العزاوي، تاريخ الضرائب العراقية، ص٥٢.

(٨٧) احمد علي الصوفي، المماليك في العراق/ صحائف خطيرة من تاريخ العراق القريب ١٧٤٩-١٨٣١، مطبعة الاتحاد الجديدة، الموصل ١٩٥٢، ص٢١٥.

(٨٨) سعدي عثمان، كوردستان الجنوبية...، ص٣٦٨-٣٦٩.

(٨٩) لوتسكي، م.س، ص٢٢.

(٩٠) فيصل محمد الارحيم، تطور العراق تحت الحكم الاتحاديين (١٩٠٨-١٩١٤)، مطبعة الجمهورية، (الموصل ١٩٧٥)، ص١٧٦-١٧٧.

(٩١) بڕوانه: غانم محمد علي، النظام المالي العثماني في العراق (١٢٥٥-١٣٣٣هـ/١٨٣٩-١٩١٤م)، رسالة ماجستير، كلية الآداب/ جامعة الموصل- ١٩٨٩، ص١٦٥-١٦٦؛ ستيڤن لونگريك، العراق الحديث...، ص٥٧.

(٩٢) بڕوانه: كاميران عبدالصمد الدوسكي، م.س، ص٥٤-٥٥.

(٩٣) عباس العزاوي، تاريخ النقود العراقية (لما بعد العهود العباسية من سنة ٦٥٦هـ/١٢٥٨م إلى سنة ١٣٣٥هـ/١٩١٧م)، طبع شركة التجارة والطباعة، (بغداد ١٩٥٨)، ص١٤١-١٤٢.

(٩٤) غانم محمد علي، م.س، ص١٦٥.

(٩٥) بڕوانه: علي شاكر علي، ولاية الموصل في القرن السادس عشر /دراسة في اوضاعها السياسية والادارية الاقتصادية ، اطروحة دكتوراه، كلية الآداب /جامعة الموصل- ١٩٩٢، ص٢٠٢.

(٩٦) بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: عباس العزاوي، تاريخ النقود...، ص١٤٥، ١٥٢-١٥٣.

(٩٧) غانم محمد علي، م.س، ص١٧١.

(٩٨) م.ن، ص١٦٥؛ هەروەها بڕوانە: خليل علي مراد، تاريخ العراق الاداري والاقتصادي في العهد العثماني (١٠٤٨-١١٦٤هـ/١٦٣٨-١٧٥٠م)، رسالة ماجستير، كلية الاداب/ جامعة بغداد- ١٩٧٥، ص٤٤١.

(٩٩) بڕوانه: غانم محمد علي، م.س ، ص١٨٦؛ هەروەها بڕوانە: علي شاكر علي، ولاية الموصل...، ص٢٠٣.

(١٠٠) غانم محمد علي، م.س، ص١٧٢؛ ستيڤن لونگريك، العراق الحديث...، ص٥٧.

(١٠١) بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: عباس العزاوي، تاريخ النقود...، ص ١٣٨ومابعدها.

(١٠٢) رحلة نيبور ...، ص٧٧.

(١٠٣) ستيڤن لونگريك، العراق الحديث...، ص٥٧.
(١٠٤) م.ن، ص٥٧.
(١٠٥) علي شاكر علي، كركوك في العهد العثماني في القرنين الثامن العشر والتاسع عشر /ملاحظات أولية، بحث غير منشور بحوزة صاحبه. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: علي شاكر علي، ولاية الموصل...، ص٢٠٤؛ أوليفية، م.س، ص٢٤.
(١٠٦) علي شاكر علي، كركوك في العهد العثماني...، بحث غير منشور.
(١٠٧) فەرسەخ: وشەیەکی فارسییە، لە بنەڕەتدا وشەکە (فرسنگ)ە، ئەم پێوانەیە پێوانەیەکی کۆنەو لە لایەن ئێرانییەکان و سەردەمی ئیسلامیشدا بەکارهاتووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ياقوت الحموي، معجم البلدان، مج ١، (بيروت ١٩٧٩)، ص٣٥.
(١٠٨) فالترهنتس، المكاييل والأوزان الاسلامية ومايعادلها في النظام المتري، ت: كامل العسلي، ط١، (عمان ١٩٧٠)، ص٩٤.

## <u>لیستی سەرچاوەکان</u>

**یەکەم/ چاپکراوی حکومی:**
- سالنامۀ ولايت موصل (١٣٠٨هـ)، مكتوبي ولايت سعادتلو حسن توفيق افندي معرفتيلة ترتيب اولنمشدر.
- سالنامۀ ولايت موصل (١٣١٠هـ)، مكتوبي ولايت سعادتلو حسن توفيق افندي معرفتيلة ترتيب اولنمشدر.
- سالنامۀ ولايت موصل (١٣١٢هـ) موصل ولايتي مطبعة سندة باصلمشدر.
- موصل ولايتي سالنامۀ رسميسيدر (١٣٢٥هـ)، عزتلو صفوت بك معرفتيلة ترتيب و دردنجي دفعة اولة رق موصل مطبعة سندة اولنمشدر.
- موصل ولايتي سالنامۀ رسميسيدر(١٣٣٠هـ)، عزتلو صفوت بك معرفتيلة ترتيب و دردنجي دفعة اولة رق موصل مطبعة سندة اولنمشدر.

**دووەم/ گەشتنامەکان:**

**أ/ بە زمانی عەرەبی:**
- اوليفيه، رحلة اوليفيه إلى العراق (١٧٩٤-١٧٩٦م)، ت: د. يوسف حبى، مطبعة المجمع العلمي العراقي، (بغداد ١٩٨٨).

- جيمس بكنغهام، رحلتي إلى العراق ١٨١٦، ت: سليم طه التكريتي، ج١، مطبعة اسد، (بغداد ١٩٦٨).
- جيمس بيللي فريزر، رحلة فريزر إلى بغداد في ١٨٣٤، ت: جعفر الخياط، ط١، مطبعة المعارف، (بغداد ١٩٦٤).
- جمس ريموند ولستيد، رحلة إلى بغداد في عهد الوالي داود باشا، ت: سليم طه التكريتي، مطبعة ثويني، (بغداد ١٩٨٤).
- كارستن نيبور، رحلة نيبور إلى العراق في القرن الثامن عشر، ت: د. محمود امين حسين، مراجعة وتعليق: سالم الآلوسي، (بغداد ١٩٦٥).
- ليونهارت راوولف، رحلة المشرق/ إلى العراق وسوريا ولبنان وفلسطين ١٥٧٣، ترجمة وتعليق: سليم طه التكريتي، دار الحرية للطباعة والنشر، (بغداد ١٩٧٨).
- محمد بن احمد الحسيني المنشيء البغدادي، رحلة المنشيء البغدادي، ترجمه عن الفارسية: المحامي عباس العزاوي، دار الجاحظ، (بغداد ١٩٧٠).
- ميجرسون، رحلة متنكر إلى بلاد مابين النهرين وكردستان، ترجمة: فؤاد جميل، ج١-٢، الطبعة الاولى، (بغداد١٩٧٠).

**ب/ بە زمانی کوردی:**

- بارۆن ئێدوارد نۆڵدە، گەشتێك بە عەرەبستان و كوردستان و ئەرمەنستاندا، وەرگێرانی لە ئەڵمانییەوە: حەمید عەزیز، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، (هەولێر٢٠٠٤).
- كلۆدیوس جێمس ریچ، گەشتنامەی ریچ بۆ كوردستان ١٨٢٠، و: محەمەد حەمە باقی، چ٢، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، (هەولێر ٢٠٠٢).

## سێیەم/ کتێبەکان

**أ/ بە زمانی تورکی:**

- شمس الدين سامي، قاموس الاعلام، مجلد (٥)، مهران مطبعه سي، استانبول ١٣١٤رومي/١٨٩٦م.

**ب/ بە زمانی عەرەبی:**

- أ.م.منتشاشفيلي، العراق في سنوات الانتداب البريطاني، ت: هاشم صالح التكريتي، مطبعة بغداد، (بغداد ١٩٧٨).
- احمد علي الصوفي، المماليك في العراق/ صحائف خطيرة من تاريخ العراق القريب ١٧٤٩-١٨٣١، مطبعة الاتحاد الجديدة، الموصل ١٩٥٢.

- د. بدرخان السندي، المجتمع الكردي من المنظور الاستشراقي، ط١، مطبعة وزارة التربية، (أربيل ٢٠٠٢).
- ستيفن هيمسلي لؤنگريك: اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ت: جعفر الخياط، (بيروت ٢٠٠٤).
- ستيفن هيمسلي لؤنگريك: العراق الحديث من (١٩٠٠-١٩٥٠)، التاريخ السياسي والاجتماعي والاقتصادي، ت: سليم طه التكريتي، ج١، ط١، مطبعة حسام، (بغداد ١٩٨٨).
- د. سعدي عثمان حسين، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر/ دراسة في علاقتها الادارية والسياسية والاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل، مطبعة سيما، (السليمانية ٢٠٠٦).
- شاكر خصباك، العراق الشمالي/ دراسة لنواحيه الطبيعية والبشرية، مطبعة شفيق، (بغداد ١٩٧٣).
- د. طارق نافع الحمداني، ملامح سياسية وحضارية في تاريخ العراق الحديث والمعاصر، ط١، دار العربية للموسوعات، (بيروت ١٩٨٩).
-عباس العزاوي: تاريخ العراق بين احتلالين، مج ٧، مطبعة شركة التجارة والطباعة المحدودة، (بغداد ١٩٤٩).
-عباس العزاوي: تاريخ النقود العراقية (لما بعد العهود العباسية من سنة ٦٥٦هـ/١٢٥٨م إلى سنة ١٣٣٥هـ/١٩١٧م، طبع شركة التجارة والطباعة، (بغداد ١٩٥٨).
-عباس العزاوي: تاريخ الضرائب العراقية من صدر الاسلام إلى آخر العهد العثماني، مطبعة شركة التجارة والطباعة، (بغداد ١٩٥٩).
- د. عبدالعزيز سليمان نوار: داود باشا والي بغداد، دار العربي للطباعة والنشر، (القاهرة ١٩٦٨).
- د. عبدالفتاح علي البوتاني، دراسات ومباحث في تاريخ الكورد والعراق المعاصر، مطبعة حاجي هاشم، (اربيل ٢٠٠٧).
- د. عماد عبدالسلام رؤوف: الموصل في العهد العثماني/ فترة الحكم المحلي ١١٣٩-١٢٤٩هـ/١٧٢٦-١٨٣٤م، مطبعة الآداب النجف الاشرف، ١٩٧٥.
-فالترهنتس، المكاييل والاوزان الاسلامية ومايعادلها في النظام المتري، ت: كامل العسلي، ط١، (عمان ١٩٧٠).
- فيصل محمد الأرحيم، تطور العراق تحت الحكم الاتحاديين (١٩٠٨-١٩١٤)، مطبعة الجمهورية، (الموصل ١٩٧٥).

- كاميران عبدالصمد احمد الدوسكي: بهدينان في أواخر العهد العثماني (١٨٧٦-١٩١٤)، ط١، مؤسسة موكرياني - اربيل، مطبعة خاني (دهوك ٢٠٠٧).
- د. كمال مظهر احمد، كركوك وتوابعها حكم التأريخ والضمير /دراسة وثائقية عن القضية الكردية في العراق، ج١، مطبعة رينوين، كوردستان، دون تاريخ.
- لوتسكي، تاريخ الاقطار العربية الحديث، ت: عفيفة البستاني، دار الفارابي، ط٧، (بيروت ١٩٨٠).
- ماجد عبدالرضا، المسألة الكردية في العراق إلى سنة ١٩٦١، مطبعة دار الجاحظ، (بغداد ١٩٧٠).
- مركز كربلاء، كركوك مدينة القوميات المتآخية، وقائع الندوة العلمية التي عقدها مركز كربلاء للبحوث والدراسات في لندن من ٢١-٢٢ تموز (يوليو) ٢٠٠١م، ط١، لندن ٢٠٠٢.
- ياسين افندي العمري ابن خيرالله الخطيب الموصلي: زبدة الاثار الجلية في الحوادث الارضية، حققه وعلق عليه: د. عماد عبدالسلام رؤوف، مطبعة الاداب، (النجف الاشرف ١٩٧٤).
- ياقوت الحموي، معجم البلدان، مج ١، (بيروت ١٩٧٩).

### جـ/به زمانی کوردی:

- د.جەلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، وەرگێڕانی لە ڕوسییەوە: د. کاوس قەفتان، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، (بەغدا ١٩٨٧).
- د. جەمال بابان، سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ب٤، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، (سلێمانی ٢٠٠٢).
- مامۆستا جەعفەر، شاری سلێمانی ململانێی گروپە کۆمەڵایەتیەکان (١٨٢٠-١٩٢٠)، چاپخانەی شڤان، ٢٠٠٦.

## چوارەم: نامەی زانکۆیی بلاونەکراوە:

### أ- تێزی دکتوراە:

- عبد ربه سكران الوائلي، أكراد العراق (١٨٥١-١٩١٤)/ دراسة في التاريخ الاقتصادي والاجتماعي والسياسي ، كلية الآداب/ جامعة القاهرة- ١٩٨٧.
- علي شاكر علي، ولاية الموصل في القرن السادس عشر/ دراسة في اوضاعها السياسية والادارية الاقتصادية ، كلية الآداب /جامعة الموصل- ١٩٩٢.

### ب- نامەی ماستەر:

١- بەزمانی کوردی:

- بەختیار سەعید مەحمود شوانی، کەرکوك لە سەدەی نۆزدەهەمدا/ لێکۆلینەوەیەك لە بارودۆخی ڕامیاری و ئابووری، نامەی ماستەر ، کۆلێژی ئەدەبیات/ زانکۆی سەلاحەدین – هەولێر ٢٠٠٨.

٢- بەزمانی عەرەبی:

-خليل علي مراد، تاريخ العراق الاداري والاقتصادي في العهد العثماني (١٠٤٨-١١٦٤هـ/١٦٣٨-١٧٥٠م)، كلية الاداب/ جامعة بغداد- ١٩٧٥.

- غانم محمد علي، النظام المالي العثماني في العراق (١٢٥٥-١٣٣٣هـ/١٨٣٩-١٩١٤م)، كلية الآداب/جامعة الموصل - ١٩٨٩.

- نمير طه ياسين، بدايات التحديث في العراق ١٨٦٩-١٩١٤، جامعة المستنصرية، ١٩٨٤.

**پێنجەم: ئینسایکلۆپیدیاکان:**

- E.J.Brill, The Encyclopedia of Islam, New Edition, 1986, vol. 5, Art (Kirkuk).

- The New Encyclopedia Britannica, vol. v, USA 1977.

**شەشەم/ وتارو توێژینەوە:**

**أ/ بە زمانی عەرەبی:**

- د. ابراهيم خليل احمد، الحياة الاجتماعية في ولاية الموصل، مجلة (المؤرخ العربي) ع٣٩، ١٩٨٩.

- د. عبدالجبار قادر غفور: اربيل في السالنامات العثمانية، مجلة (كاروان) ، ع٩١، ١٩٩٠.

-د. علي شاكر علي، كركوك في العهد العثماني في القرنين الثامن عشر والتاسع عشر/ ملاحظات اولية، (بحث غير منشور بحوزة مؤلفه).

- محمد عبدالله عمر، الامن القومي الكوردي لاراضى محافظة كركوك الزراعية، گۆڤاری (هاواری کەرکوك)، ع١، (اربيل ١٩٩٨).

**ب/ بە زمانی کوردی:**

- د. سەعدی عوسمان (وەرگێڕان و پەراوێز بۆ نووسین)، گەشتی دکتۆر ئێڤز بە کوردستاندا، گۆڤاری (مەتین)، ژ١١٩، (دهۆك ٢٠٠١).

## ملخص البحث

# النشاط التجاري في كركوك خلال القرن التاسع عشر


**أ.م.د.سعدي عثمان هروتي**
قسم التاريخ- كلية الآداب
جامعة صلاح الدين- اربيل

**م.م.بختيار سعيد شواني**
قسم التاريخ - كلية العلوم الانسانية— رانية
جامعة كويه



تناول هذا البحث النشاط التجاري في كركوك وتوابعها خلال القرن التاسع عشر، واوضح بأن المدينة قد اضحت مركزاً تجارياً في المنطقة بحكم توسطها المنطقتين الجبلية والسهلية. ووقوعها على طرق تجارية عدة، وخاصةً طريق (بغداد- كركوك- اربيل- الموصل). ولكن عوامل اخرى اثرت سلباً على نشاطها التجاري، منها: رداءة الطرق وتخلف وسائط النقل وانعدام الامن، وكذلك سوء تصرف المسؤولين العثمانيين في بعض الاوقات. وعلى الرغم من ذلك كانت لكركوك سوقاً داخلية عامرة، حيث ضمت (١٢٨٢) محلاً تجارياً في عام ١٨٩٤. وكانت تجارتها الخارجية مع الاقاليم المجاورة نشطة ايضاً، إذ كانت تحصل على العديد من السلع عن طريق بغداد والموصل، كالسكر والقهوة والاقمشة والبسط وبعض المصنوعات الهندية والاوروبية. كما كانت تصدر بعض السلع - وخاصة المنتوجات الحيوانية والزراعية- عبر هذين المنفذين. وكان لتجار كركوك صلات تجارية مهمة مع المناطق الكردية المجاورة ايضاً وخاصةً السليمانية واربيل. وقد فرضت الدولة انواعاً من الرسوم على التجارة، منها رسم العبور والرسوم التي كانت تفرض على مداخل المدن.

## Abstract

# *The trade in Kirkuk during the 19th century*

***Dr.Saadi Uthman Haruti***
Assistant prof
History Dept.Colleges of Arts
Salahaddin univ. Erbil

***Bakhtiar Saeed Shwani***
Assistant lecturer
History Dept.Colleges of Human scince
Koya univ.

This research dealing with the trade sector in Kirkuk district during the 19th century. And it proved that this city was became a commerce center, because its position between mountains and plane areas. Also it situated on the some important trade ways, like: Baghdad- Kirkuk-Erbil-Mosul road. But there was some factors plaid negative role in this side, like rotten of roads, bad transfer instrumentality, and absence of security in some times. In spite of this we can say that Kirkuk have a crowed internal market, which contained (1282) shops in 1894. Also the city has an active commerce with the neighbor province. It imported many commodities from Baghdad and Mosul and across them, such as sugar, coffee, cloths, carpets, and some Indian and European industry products. In the same time Kerkuk was exported some kind of its products- especially agricultural and faunas products- by this tow ways. Kerkuk tradesman's also have commerce relations with Sulaimani and Erbil. Finally the study made clear that the authorities put on some kind of taxes on the commerce activity, especially in the gates of cities, also in the passages.

# شرۆڤەکرنا دیسکۆرسی ـ رێزمانی بۆ چیرۆکا (مریبایێ ئاغای) د ناڤ هەر دوو ئاستێن گر و هویر دا

**عەبدولسەلام نەجمەدین عەبدوڵلا**
**مامۆستای یاریدەدەر – بەشی زمانی کوردی**
**کۆلێژی پەروەردە - زانکۆی دهۆك**

**پوختە**

ئـەڤ ڤەکۆلینـە لـژێر نـاڤێ (شـرۆڤەکرنا دیـسکۆرسی ـــ رێزمـانی بـۆ چیرۆکا (مرێبـایێ ئاغـای) د نـاڤ هـەر دوو ئاسـتێن گـر و هـویر دا) هـەوڵ ددەت باسـێ فاکتـەرێن پێکڤـە گرێـدانا نـاڤخۆیی یـا دەقـی ($Cohesion$) لـدویف بـیرو بۆچـوونێن هالیـدای دنـاڤ هـەر دوو ئاسـتێن گـر و هـویر دا بکەت. بۆ ڤێ چەندێ ژی مفا ژ ئامارەکا تەواوا فاکتەرێن پێکڤـە گرێـدانێ هاتیە وەرگرتن کو تێدا دیار دبیت د ناڤ ئاستێ گرێ دەقی دا ب پلا ئێکـێ مفـا ژ (لێ زڤرینـێ) و ل پـلا دوویـێ مفـا ژ (فاکتـەرێ پـەیڤی) هاتیـە وەرگـرتن بـشێوەیەکی کـو هـەر دوویـان پێکڤـە (٨. ٦٩٪) یـا سـەرجەمێ پێکڤەگرێـدانێن دەقـی پێـك ئینایـە. د ئاسـتێ هـویر ژی دا رێـژا رسـتێن راگەهاندنا رووت (٦٢,٨٪)ـە. رێـژا رسـتێن تـەواو (٨٠,٧٪)ـە. رێـژا رسـتێن بکەر دیار (٩٩,١٪)ـە کو ئـەڤ رێـژا بکار ئینـانێ دگـەل ئاخفتنـا رۆژانـە دا دگونجیـت، لێ رێـژا بکار ئینانـا رسـتا سادە (٧٠,٧٪)ـە کو دگـەل ئاخفتنـا رۆژانە دا ناگونجیت، لێ ئەڤ رێژەیە دگـەل رێـژێن پێکهاتێن سـەری بوویـە ئەگەرێ کورتبریێ دناڤ دەقی دا.

## پێشەکی

ئەڤ ڤەکۆلینە پێك هاتیە ژ شرۆڤەکرنەکا دیسکۆرسی - رێزمانی بۆ دەقێ چیرۆکا (مریێبایێ ئاغای)، کو تێدا هەولێ ددەت فاکتەرێن پێکڤە گرێدانێ دناڤ ڤی دەقی دا دەستنیشان بکەت.

گرنگیا ڤی بابەتی د وێ چەندێ دایە کو ڤەکۆلینێن دیسکۆرسی دشێن ببنە بناغە بۆ ڤەکۆلینێن بەرفرەهتر مینا دەستنیشانکرنا شێوازێ نڤیسەرەکی یانژی بەراوردکرنا شێوازێ چەندین نڤیسەران هەروەسا دشێت د بیاڤێ وەرگێرانێ ژی دا مفا ژێ بهێتە وەرگرتن.

ئەگەرێ هەلبژارتنا ڤێ چیرۆکێ ژی ئەوە کو ئەڤ چیرۆکە هەتا رادەیەکێ زۆر ژ شێوازێ ئاخفتنا رۆژانەیا خەلکی نێزیکە و دوورە ژ هونەرکاری و ئاخفتنا دەستکرد لەوا ئەنجامێن وێ دێ راستەقینەتر بن.

ڤەکۆلین ل هەر دوو ئاستێن گر- $Macro\ level$ و هویر – $Micro\ level$ دا هاتیە ئەنجامدان لێ ژ بوونا سنووردار بوونێ بتنێ فاکتەرێ پێکڤەگرێدانا ناڤخویی یا دەقی ($Cohesion$) هاتیە وەرگرتن هەروەسا د پراکتیکێ ژی دا بتنێ ئێك چیرۆك هاتیە وەرگرتن.

د ڤێ شرۆڤەکرنا دیسکۆرسی دا مفا ژ بیروبۆچوونێن هالیدای هاتیە وەرگرتن. دابەشکرنا بابەتێن ڤێ ڤەکۆلینێ ژی ب ڤی شێوەیە کو ل دەستپێکی پوختەیەك هاتیە و پاشان پێشەکی هاتیە و تێدا باسی گرنگی، ئەگەرێن هەلبژارتنا بابەتی، سنوور، رێباز و پشکێن ڤەکۆلینێ هاتیە کرن. پشتی ڤان رۆنکرنان ڤەکۆلین ل سەر ڤان پشکێن خواری هاتیە دابەشکرن:

١- پێشینەیا دیروکی، دڤێ خالێ دا هەولێ هاتیە دان کو باسی دیروکا سەرهلدانا شرۆڤەکرنێن دیسکۆرسی بهێتە کرن.

٢- شرۆڤەکرنا دەقی و شرۆڤەکرنا دیسکۆرسی، لڤێرێ هەولێ هاتیە دان دناڤبەرا هەردوو چەمکان دا جیاوازی بهێتەکرن.

٣- ئەركێن زمانی، دڤێ خالێ دا هەولێ هاتیە دان كو باسی ئەركێن زمانی ل نك هالیدای بهێتە كرن و جهێ پێكڤەگرێدانێ دناڤ ڤان ئەركان دا بهێتە دەستنیشانكرن.
٤- پێكڤەگرێدان، د ڤێ پشكێ دا پێكڤەگرێدان هاتیە پێناسە كرن و فاكتەرێن وێ هاتینە دەست نیشانكرن و بۆ پتر رۆن بوونا بابەتی ژی نموونە ژ چیرۆكا (مرێبایێ ئاغای) هاتینە وەرگرتن.
٥- زمانڤانیا گر و هویر، تێدا باسێ فاكتەرێن پێكڤەگرێدانێ دناڤ هەر دوو ئاستێن گر و هویر دا هاتیە كرن.
٦- شرۆڤەكرنا داتایان، دڤێ خالێ دا ئەو ئامارا كو ژ ئەنجامێ شرۆڤەكرنا داتایان ب دەست هاتی، هاتیە نیشادان.
ل داویێ ژی ئەنجام و لیستا ژێدەران و پوختێ ڤەكۆلینێ ب زمانێ عەرەبی و ئینگلیزی هاتینە.

**پێشینەیا دیروكی**

بناغێ زانستێ شرۆڤەكرنا دیسكۆرسێ - *Discourse analysis* بۆ ٢٠٠٠ سالان بەری نهو دزڤریتەڤە، واتە بۆ سەردەمێ بەلاڤ بوونا رەوانبێژیێ و سەردەمێ چەواتیا دروست ئاخفتنێ دزڤریتەڤە، لێ سەرهلدانا ڤی زاراڤی بۆ سالێن شێستان دزڤریتەڤە. (رومینا یمینی: ١٣٧٨: ٢) زاراڤێ دیسكۆرس بۆ جارا ئێكێ ل سالا ١٩٥٢ێ د وتارەكا زمانڤانێ بناڤ و دەنگێ ئنگلیزی (زلیك هریس)ی دا هاتیە بكارئینان پشتی هینگێ چەندین زمانڤانان ڤەكۆلین ل دیسكۆرسێ كرییە، بتایبەتی ژلایێ (ماتیوس)ی كو سەر ب قوتابخانا(پراگ)ێ بوو و ژ لایێ (فرث)ی كو سەر ب قوتابخانا (لەندەن) بوو هەر وەسان ل سالێن داویا سەدێ بووری ژی (هالیدای و روقەیا حەسەن)ێ ڤەكۆلین ل دیسكۆرسێ كرینە.(هالیدای و روقەیا حەسەن) د پەرتوكا خوە دا بناڤێ (*Cohesion in English*) باسی فاكتەری پێكڤە گرێدانێ د هەر دوو زمانێن ئنگلیزی و فارسیدا

کرینه،پشتی ڤێ پەرتووکێ ژی هالیدای لسەر ڤەکۆلینێن خوە لدور دیسکۆرسێ بەردەوام بوو و بڤی رەنگی بیروبوچوونێن هالیدای لدور دیسکۆرسێ و فاکتەرێن (پێکڤە گرێدان)ا دەقی بووینە بناغە بۆ هەمی ڤەکۆلینێن پشتی وی.

شرۆڤەکرنا دیسکۆرسی د چارچووڤێ زمانڤانییێ دا نەراوەستا و دماوەیەکێ گەلەکێ کێم دا و ب پێکولا هندەك زانایێن مینا (ژاك درێدای، میشل فوگوی و...هتد) ژ زمانڤانییێ بەرەڤ ڤەکۆلینێن جڤاکی، سیاسی و کلتووری چوو و شێوەیەکێ رەخنەیی ( *Critical discourse analysis*) بخوە ڤەگرت و وەك زاراڤەکێ سەرەکی د هزرا فەلسەفی، جڤاکی، سیاسی، و دگەل چەمکێن مینا هێز، رەگەز پەرەستی و...هتد دا بکار هات.بڤی رەنگی چەمکێ ڤی زاراڤی د بیاڤێن دی یێن نە زمانیدا ژ چەمکێ خوەیێ سەرەکی دوور کەفتیە و هاتیە گوهورین.

### شرۆڤەکرنا دەقی و شرۆڤەکرنا دیسکۆرسێ – -*Text analysis Discourse analysis*

زمانڤانی د رێرەوا خوەیا وەرارێ دا دیدەڤانێ گەلەك تیۆر و نێرینانە، بەری(١٩٦٠)ێ زمانڤانان ڤەکۆلین ل سیستەمێ فۆرمی یێ زمانی- *Formal system* دکر لێ ژ وێ دیرۆکێ وێڤە ژ بلی سیستەمێ فۆرمی ئاستێ ئەرکی- *Functional* ژی هاتە وەرگرتن.

ئەڤ نێرینا نوی بوو ئەگەرێ پەیدا بوونا دوو لقێن نوی د زمانڤانییێ دا ، یا ئێکێ شرۆڤەکرنا دەقی –*Text Analysis* و یا دی شرۆڤەکرنا دیسکۆرسێ - *Discourse Analysis* بوو.

نهو لخوارێ دێ هەول دەین بکورتی باسی نێرینا هندەك ڤەکۆلەرێن ڤی بیاڤی لدور هەر دوو لقێن نوو یێن زمانڤانییێ بکەین:

## شرۆڤەکرنا دەقی - *Text analysis*:

جێمز د پێناسا دەقی دا دبێژیت: ((دەق بریتیە ژ چەواتیا رێکخستنا رستان دناڤ چارچووڤێ یەکە یێن مەزنتر ژ رستێ -*Supra sentential* واتە دناڤ دەقی دا.) (سید محمد حسین معصوم: ١٣٨٤: ٦)

عەبدولواحـد مـشیر دزەیـی دبێـژیت: ((دانەیـەکی سـیمانتیکییە و پێوەندی بە واتاوە هەیە نەك فۆرم، کە بریتییە لە زنجیرە رۆنانێکی زمان و یەکەیەکی گشتی تەواو پێکدێنێ و رستەکان واتای یەکتری تەواو دەکـەن تـا کۆتـایی دەق واتــە، واتـای رسـتە پـشت بـە واتـای رسـتەکانی تـر دەبەستێت.)) (عەبدولواحد مشیر دزەیی: ٢٠٠٥: ٤٣)

براون و یول (دەق کەرەستێ بەرجستەکرنا ئاخفتنێیە.) (جلال رحیمیان: ١٣٨١: ٤٤)

بڤی رەنگی د شرۆڤەکرنا دەقی دا کا چـەوان رسـتە وەکـو یەکەیـەکا سـەربەخۆ دهێتـە وەرگـرتن ب هـەمان شـێوە ژی دەق وەکـو یەکەیـەکا سەربەخۆ دهێتە وەرگرتن. د شرۆڤەکرنا دەقـی دا، دەق دوور ژ فاکتـەرێن دەوروبەر مینا جھ، دەم و ...هتد دهێتە وەرگرتن و باسێ چـەواتیا رۆنانـا ڤێ یەکێ دهێتە کرن، ئەو یەکەیا کو ژ ئەنجامێ رۆنانـا کۆمـەکا یەکـەیێن دیـتر (رسـتە) پێـك دهێـت .کەواتــە لڤێـرێ هـەولێ دهێتــە دان دوور ژ بکارئینانێ، یاسایێن رۆنانا دەقی دناڤ زمانێ دیارکریدا بهێنـە دەستنیـشان کرن.

## شرۆڤەکرنا دیسکۆرسێ- *Discourse analysis*:

ئـستابز د پێناسـا دیـسکۆرسێ دا دبێـژیت: ((دیـسکۆرس هـەولێ ددەت ڤـەکۆلینێ ل سیـستەم و رێکخـستنا سـەروو رسـتێن زمـانی وەکـی دانوستاندنێ یانژی دەقێن نڤێسی بکەت. )) (جلال رحیمیان: ١٣٨١: ٤٤)

سولحجو دبێژیت: (دیسکۆرس هەلسوکەوتێ دگەل یەکەیێن مەزنتر ژ رستێ دکەت، کا چەوان دشێن ب هاریکاریا یاسایێن رێزمانی، ناڤێن نەسادە، فرێز و رستان دروست بکەن و ب هەمان شێوە دشێن ب هاریکاریا

دیسکۆرسێ رستان ب شێوەیەکی دەربرین کو پێوەندی ب هەڤرا هەبیت، بشێوەیەکی کو خوینەر یانژی گوهدار بساناهی ژ رستەیەکێ بۆ رستەیەکا دی بچیت.) (صلحجو: ١٣٧٧: ٧)

**رابرت دبێژیت:** (( دیسکۆرس بریتییە ژ پارچەیەکا مەزن و ئێکگرتیا زمانی.)) (رابرت لارنس تراسك: ١٣٨٠: ١٦٨)

**ئادریان و هەڤالێن وی دبێژن:** ((دیسکۆرس ڤەکۆلینێ ل یەکەییێن زمانی و بکار ئینانا زمانی دکەت، ئەو یەکەییێن کو پتر ژ رستەیەکێ نە، لێ ب هاریکاریا سیستەمەکی ژ ناڤونیشانان پێکڤە هاتینە گرێدان، ب واتایەکا دی دیسکۆرس ڤەکۆلینێ ل وان رستان دکەت کو ئێك لدویف ئێکێ دهێن و پێکڤە دگرێداینە. (آدریان آکمیاج و دوستان: ١٣٨٢: ٣٨٠)

ژڤان پێناسان دگەهینە وێ ئەنجامێ کو د شرۆڤەکرنا دیسکۆرسێ ژی دا مینا شرۆڤەکرنا دەقی یەکەییێن مەزنتر ژ رستێ دهێنە وەرگرتن لێ د شرۆڤەکرنا دیسکۆرسێ دا بەروڤاژی شرۆڤەکرنا دەقی بکارئینان ژی دهێتە وەگرتن واتە پێکڤەگرێدانا دەقی بتنێ ب هاریکاریا رۆنانا سەرڤە و ئامادە دناڤ دەقی دا دروست نابیت بەلکو پێتڤیە گریدانا دەقی دگەل دەوروبەری ژی دا بهێتە وەرگرتن و گرنگی ب فاکتەرێن مینا گریمانێن پێشەکیێ و بنەماییێن هەڤکاریێ و ...هتد ژی بهێتە دان. لێ سەرەرای ڤێ چەندێ تێکەلیەك دناڤبەرا ڤان هەر دوو زاراڤاندا هەیە لەوا گەلەك ژ زمانڤانان ب مەبەستا ژ ئێك جۆداکرنا زاراڤێن (شرۆڤەکرنا دەقی) و (شرۆڤەکرنا دیسکۆرسێ) ژ هەڤدوو هەولێ دایە ((زاراڤێ (شرۆڤەکرنا دەقی) بتنێ بۆ دەقێ نڤێسی مینا چیرۆك، هۆزان و...هتد بکار بینن و زاراڤێ (شرۆڤەکرنا دیسکۆرسێ) بۆ ئاخفتنێ مینا ( دیالوگێ و ...هتد.) بکاربینن. (جلال رحیمیان: ١٣٨١: ٤٥) لێ هەر ئەڤ جۆداکرنە ژی ب تەواوەتی ڤان هەردوو زاراڤان ژ هەڤدوو جۆدا ناکەت چونکی مەبەست ژ ڤێ جۆداکرنێ هەر ئەوە کو بێژیت د یا ئێکێ دا فاکتەرێن دەوروبەر ناهێنە وەرگرن و د یا دووێ دا ئەو فاکتەر دهێنە وەرگرتن؛ ئەم د

شـرۆڤەكرنا دیـسكۆرسی دا دشـێین دەقـێ چـیرۆكەكێ یـان هـەر دەقـەكێ دیترێ نقێسی وەربگرین و ژ دوو لایانقـه واتـه پێكڤەگریـدانا نـاڤخویی یـا زمـانی و پێكڤەگرێـدانا وێ دگـەل دەوروبـەری دا بـاس بكـەین. باشـترین جۆداكرن دناڤبەرا ڤـان هـەر دوو لقـان دا ژلایـێ سـولحجویڤە هاتیـە كـرن، بڤـی رەنگـی كـو((دیـسكۆرس كومەلـە تـوخم، كەرەسـتە و بـارەدۆخن كـو ئەگـەر پێكڤـە كـۆم بـبن دەقـەكی پێـك دئیـنن، كەواتـە دەق ئـەنجام و بەرهـەمێ دیـسكۆرسێ یـە. ب واتایـەكا دیـتر دیـسكۆرس ژێـدەرە و دەق بەرهەمە.دیسكۆرس خودان بزاڤە و دەق راوەستایە. دیسكۆرس بێ وەرگـر پێشڤە ناچیت لەوا فرێكەر پێتڤیە چ د ئـاخفتنێ دا یانـژی د نڤێـسینێ دا وەرگرەكـێ گریمانـەیی بـۆ خـوە دانیـت چـونكی بـەروڤاژی ڤـێ چـەندێ دیسكۆرس بشێوەیەكێ رێكخستی بەرەڤ پێـشڤە ناچـیت و دەقـەكێ تـەواو، دروسـت ناكـەت.)) (صـلحجو: ١٣٧٧: ٨) لـەوا لڤێـرێ مەبەسـتا مـە ژ دیسكۆرسێ ئەو توخم،كەرەستە و بارەدوخن كو دەقەكی پێك دئینن واتـه ئەم بەرهەمێ دیسكۆرسێ (دەقی) وەردگرین و ل فاكتـەرێن بەرهـەمئینانا وی دەقی (دیسكۆرسێ) دگەرییێین.

**ئەركێن زمانی و پرۆسا پێكڤەگرێدانێ**

هالیدای سێ ئەركێن زمانی دەستنیشان دكەت: (مهران مهاجری و محمد نبوی: ١٣٧٦: ٣٩-٦٥)

١- ئەركێ هزری (*Ideational Function*)

ئـەڤ ئەركـە بریتیـە ژ رەنگڤـەدانا دورهێلـی كـو هـەلگرێ ناڤـەرۆكا ئاخافتنێ یە. ب واتایەكا دیتر ئاخفتنكەر باسی ئەزموون و هەستا خوە ل هەمبەر جیهانا دەرڤە دكەت. ب هاریكاریا ڤـی ئـەركێ زمـانی ئـەم دشـێین جیهانـا دەرڤـە دابەشـی سـێ پـشكان بكـەین یانـژی ب واتایـەكا دیـتر هـەر بەندەك ژ سێ پشكان پێك دهێت:

أ- پرۆسـە (*Process*) كـو چـاڤدێرە لـسەر رویدانـەكێ، رەنگڤەدانـەكێ، دۆخەكی، پرۆسەكا سۆزداری، ئاخفتنێ یانژی هەبوونێ.

ب- پشکدارێن پرۆسێسێ کو بریتینە ژ فاکتەرێن پشکدار د وێ پرۆسێ دا و ل چارچووڤێ پرۆسێ دا کار دکەن. ئەڤ فاکتەرە دشێن یان هۆکارێ پرۆسێ بن یان پرۆسە لسەر وان روی دابیت، یانژی مفا ژ پرۆسێ وەرگرتبن.

ج- فاکتەرێن دەوروبەرێ پرۆسێ (*Circumstantial Elements*) ئەو فاکتەرن کو دەم و جھ و شێوێ کارکرنێ و ئامیر و کەرەستە و دوخێ پرۆسێ دەستنیشان دکەن.

**بۆ نموونە:**

((ئەزبەنی بەری نڤێژا ئێڤارێ من لنك ئاشی دیت.)) (محمد سلیم سواری: ١٩٨٣ :١٢)

((دیت)) پرۆسە

((ئەزبەنی)) و ((من)) و ((ئەو= Ø)) پشکدارێن پرۆسێ

((بەری نڤێژا ئێڤارێ )) و (( لنك ئاشی)) فاکتەرێن دەوروبەرێ پرۆسێ نە.

### ٢- ئەرکێ کارلێکرنێ ( *Interact ional function*):

زمان ب ئەرکێ دروست کرنا پێوەندیێ، پاراستن، جێگیر کرن و رێکخستنا پێوەندییێن جڤاکی رادبیت، ب دەربرینەکا دی ئاخافتنکەر یانژی نڤیسەر مفا ژ دۆزەکێ وەردگریت تا وەکو ب هاریکاریا وێ پێوەندیێ دگەل کەسێن دەوروبەر یانژی خوینەری دا بکەت، بڤی رەنگی زانیاریەکێ ددەت، فەرمانەکی ددەت، پرسیارەکێ دکەت و ئەنجام دانا خزمەتگوزاریەکێ پێشنیاز دکەت.

**بۆ نموونە:**

((سوحبەتا چ سۆفی؟)) راگەهاندنا پرسیار

( محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ١٠)

((ئەو زەلامێت نوکە ل گوندی بلا بچن بۆ توربەکی بکولن، مەلا ژی بلا بشوت و کفن کەت)). فەرمان دان

(محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ١٠)

**((ل دەرڤەی رێکێ د چوو ...بەلێ گەلەکێ بلەز بوو)). راگەهاندنا رووت**

**(محمد سليم سواری: ١٩٨٣: ١٢)**

**((بێ دەنگ ل گوندی دەرکەڤە ...هێش کەسێ نەزانی)). پێشنیاز کرن**

**(محمد سليم سواری: ١٩٨٣: ٩١٤)**

**٣- ئەرکێ دەقی ( *Textual function*):**

**لدویف ڤی ئەرکی ئاخفتنکەر یانژی نڤیسەر پەیامەکێ کو لسەر بناغی هەر دوو ئەرکێن سەری دروست بوویە، ل شێوێ ئاخفتن یانژی نڤیسین (یانژی هەر شێوەکێ دی) رێك دئێخیت و ڤەدگوهێزیتە کەسێ بەرامبەر. ب واتایەکا دی ب بەرچاڤگرتنا هەر دوو ئەرکێن سەری دەقەکی دئافرینیت، چونکی دەق دانەیەکا واتای یە و هەر ب هاریکاریا ڤی ئەرکی یە کو گوهدار یانژی خوینەر دشێت دەقەکی ژ کومەکا رستێن هەرەمەکی جۆدا بکەت.**

**هالیدای پێکهاتا دەقی (یان بەندێ) دابەشی دوو پێکهاتەیێن جیاواز دکەت، واتە دابەشی (پێکهاتا نیهاد - گوزارە *Structure thematic*) و (پێکهاتا زانیاریێ *Information structure*) و پشکەکا نەپێکهاتەیی واتە (پێکڤەگرێدانێ *Cohesion*) دکەت.**

**نموونە بۆ پێکهاتان:**

**((فەقێ هەر دوو تەپێت خو ل سەرێ خو دان.))**

**(محمد سليم سواری: ١٩٨٣: ٩)**

**فەقێ = نیهاد**

**هەر دوو تەپێت خو ل سەرێ خو دان = گوزارە**

**د ڤێ نموونێ دا فەقێ (زانیاریا کەڤنە) چونکی بەری وێ جارەکا دی د ناڤ دەقی دا هاتیە و (هەر دوو تەپێت خو ل سەرێ خو دان) زانیاریەکا نوویە چونکی بەری وێ دناڤ دەقی دا نەهاتیە.**

**نموونە بۆ پێکڤەگرێدانێ:**

(( ژ تە وەرە ئەم نزانین.)) ( محمد سليم سواری: ١٩٨٣: ٩)

لڤێرێ بۆ پێكڤەگرێدانێ مفا ژ (لێ زڤرینێ) هاتیە وەرگرتن، بڤی رەنگی كو (تە) بۆ فەقێ و (ئەم) بۆ (ئاغای و كورێ ئاغای) دزڤریتەڤە، هەروەسا بابەتێ (كوشتنێ) ب شێوەیەكێ نەراستەوخۆ هاتیە گوتن و لێ زڤرینە (*Forward-reference*) بۆ رویدانەكا بەرێ و پشتی ماوەیەكی خوینەر پێ دهێتە ئاگەهداركرن.

لخوارێ دێ هەولێ دەین ب درێژی لسەر بابەتێ پێكڤەگرێدانێ و فاكتەرێن وێ باخڤین.

**پێكڤەگرێدان**

هەر وەكی هاتیە گوتن ئێك ژ ئەركێن زمانی ئەركێ دەقییە دڤی ئەركی دا نڤیسەر هەولێ ددەت كو رەگەزێن پێكهێنێن دەقێ خوە ب شێوەیەكی رێك بێخیت كو وەكو یەكەیەكا تێكرستی بهەڤرا یا گرێدای بیت ئەڤ كارە ب چەند پرۆسەیەكان دهێتە ئەنجام دان ئێك ژ وان پرۆسان پێكڤەگرێدانا دەقییە. نهو دێ هەولێ دەین ب كورتی ڤێ پرۆسێ پێناسە بكەین.

((پێكڤەگرێدان بریتیە ژ پێوەندیا دناڤبەرا پشك و توخمێن ناڤخۆیی یێن دەقی و چ پێوەندی ب گریمانێن پێشیێ و بنەماییێن هەڤكاریێ و ...هتد ڤە نینە.)) (علی صلحجو: ١٣٨٥: ٢٣)

((پێكڤەگرێدان چەمكەكێ سیمانتیكیە ( *Semantic concept* ) كو ئاماژێ ددەتە پێوەندییێن واتایی یێن ناڤ دەقی ونازناڤێ دەقینیێ ددەتە وی بەرهەمی.)) ( *Halliday and hassan:1976:4* )

لدویف هەر دوو پێناسان دشێین بێژین كو بۆ دروست بوون و تێكرستی بوونا هەر دەقەكی پێتڤی یە دوو پرۆسە هەبن واتە پرۆسا پێكڤەگرێدانێ - *Cohesion* و پرۆسا پێوەندیێ - *Coherence*. د پرۆسا پێكڤەگرێدانێ دا رەگەزێن پێكهێنەرێن دەقی بتنێ دهێنە وەرگرتن واتە ئەو فاكتەرێن زمانی كو دبنە ئەگەرێ دروست بوونا دەقەكێ تێكرستی، بۆ ڤێ چەندێ ژی مفا ژ پرۆسێن رێزمانی وەردگریت

لەوا ب پرۆسا زمانی - رێزمانی ژی دهێنە نیاسین و د پرۆسا پێوەندییێ دا رەگەزێن پێکهێنەێن دەقی دگەل دەوروبەری بهەڤرا دهێنە وەرگرتن. لێ هەر وەکی هاتیە گوتن د ڤێ ڤەکۆلینێ دا ئەم بتنێ پێکڤەگرێدانێ وەردگرین ، لەوا پێوەندییێ بجھ دهێلین.

**فاکتەرێن پێکڤەگرێدانا دەقی**

هالیدای فاکتەرێن پێکڤەگرێدانا دەقی دناڤ زمانێ ئینگلیزی دا دابەشی (٥) جۆران دکەت: (*Halliday ,M.A.K:1985:290-309*)

١- لێ زڤرین- *Reference*

٢- جھ نشینی- *Substitution*

٣- ژێ برن- *Ellipsis*

٤- ئامرازێن پێوەندی- *Conjunctives*

٥- پێکڤەگرێدانا پەیڤی – *Lexical cohesions*

لدویف نێرینا وان (جھ نشینی، ژێ برن، پێکڤەگرێدانا پەیڤی) پێوەندییێن فۆرمینە کو هاریکارن د بەردەوام بوونا زانیاریان دا لسەر بناغێ پەیڤی- رێزمانی (*Lexico - grammatical*) و (لێ زڤرین) پێوەندییەکا واتاییە کو هاریکارە د بەردەوام بوونا زانیاریان دا لسەر بناغێ ( مەرجەع بوونێ- *Referentiality* ) و (ئامرازێن پەیوەندییێ) ئەو کەرەستەنە کو پێوەندییەکا لۆژیکی دناڤبەرا پشکێن ئێك لدویف ئێکێن دەقی دا دروست دکەن.

نهو دێ هەولێ دەین بکورتی لدور ڤان فاکتەران باخڤین و بۆ پتر رۆن بوونا وان دێ نموونان ژ چیرۆکا (مرێبابیێ ئاغای) وەرگرین.

### ١- لێ زڤرین- *Reference*

لێ زڤرین ژ لایەکی ڤە بریتیە ژ پێوەندیا دناڤبەرا دەربرینێن زمانیدا و ژ لایەکێ دی ڤە بریتیە ژ وان تشتان یانژی سالوخەتێن بەرجستە (یانژی هندەك بابەت ژ تشتان و سالوخەتێن گرێدای ب وانڤە) ئەوێن دشیان دا هەیە ئاماژە پێ بهێتە دان یانژی دەلالەتەك بۆ بهێتە کرن. (لطف الله یار محمدی: ١٣٨٣ : ٩)

كەواتە لێ زڤـرين بريتيـە ژ وێ پێوەنـديا دناڤبـەرا رەگـەزێن دەقـی دا پەيـدا دبيـت بڤـی شـێوەی كـو رۆن بوونـا واتـا و مەبەسـتا رەگـەزەكێ دەقـی دێ ب رەگەزەكێ دی ڤە هێتـە گرێـدان ڤێجا ئـەو رەگـەز دنـاڤ دەقی دا بيـت يانـژی ل دەرڤەی دەقی بيت، لێ ئەوا د ڤی بابەتی دا پتر مەبەستا مـە پـێ ئـەو پێوەنديـە ئەوا دناڤبەرا رەگەزێن ناڤ دەقی دا پەيدا دبيت. لەورا ئـەم دشـێين ڤـێ لێ زڤرينـا دناڤ دەقی دا بڤی شێوەی پێناسە بكەين (( لێ زڤرين د شـرۆڤەكرنا رێزمـانی دا، بۆ جۆرەكێ پێوەنـديا ناسـينێ دناڤبـەرا يەكـەيێن رێزمانيـدا دزڤريتەڤـە ئەگـەر هات و ئەڤ لێ زڤرينە بۆ پشكەكێ ژ ئـاخفتن بـەرێ بيـت ب  پـێش – لێ زڤـرين (*Forward-reference*)و ئەگەر هات بۆ پشكەكێ ژ ئاخفتن هێشتا نەهاتی گوتن بزڤريتەڤـە ب پـاش-لێ زڤـرين (*Back-reference*) دهێتـە نياسـين.)) (ابراهيم چگنی: ١٣٨٢: ٣٨٣)

لێ زڤرين دناڤ ديسكۆرسێ دا ب هاريكاريا چەندين فاكتەران دهێتە ئەنجام دان:

١- جهناڤ و نيشانێن رێككەفتنێ

١- جهناڤێن كەسی
٢- ئامرازێن ئاماژە پێ كرنێ
٣- هەڤالناڤێ رێژەيی (تفضيلی)
٤- هەڤالناڤێ نياسينێ

**بۆ نموونە:**

**نيشانێن رێككەفتنێ:**

(( مالا عەبدالی وێران كر$\emptyset$.)) ( محمد سليم سواری: ١٩٨٣: ١٢)

((ئەو زەلامێن ل گوندی بلا بچن توربەكی بۆ بكولن.))

( محمد سليم سواری: ١٩٨٣: ١٠)

جهناڤ:

((دا بزانت كا چەوا پاتە خورەكێ وەك وی دێ مرێبايەكێ من كوژيت.))

(محمد سليم سواری: ١٩٨٣: ١٣)

**ئامرازێن ئاماژە پێکرنێ:**

(( ئەڤە چییە؟... .)) ( محمد سليم سوارى: ١٩٨٣: ٩)

((ئەڤە نە برینێت چفتێ نە برینا چفتێ دبتە بۆت.))

( محمد سليم سوارى: ١٩٨٣: ١٣)

**هەڤالناڤێ نیاسینێ:**

((دێ ب وێ رێکێ چت ئەو رێکا عەبدال پێ چووی.))

(محمد سليم سوارى: ١٩٨٣: ١١)

### ٢- ژێ برن- *Ellipsis*

واتە ((ژێ برنا رەگەزێن سەرەکی دناڤ رستێدا.)) (گرور هادسن:١٣٨٣: ٥٤٨) بڤی رەنگی کو دناڤ دەقەکی دا هندەك رەگەز ب مەبەستا دووبارە نەبوونێ دهێنە ژێ برن ئەو ژی ل وی دەمی دبیت، دەمێ د رستا بەری هینگێ دا هاتبیت و وەرگر ئاگەهداری وی رەگەزێ ژێ بری بیت لەوا ژێ برنا وێ کارتێکرنێ ل واتا رستێ ناکەت و دبیتە ئەگەرێ پێکڤە رستنا ڤان رستان. لدویف نێرینا (هادسن)ی زانینا سەبارەت ب ئەگەرێن(ژێ برنێ) گرێدای توانستا رێزمانییە.(گرور هادسن:١٣٨٣: ٥٤٨) واتە د هەر زمانەکی دا هندەك ژێ برن رێ پێدهێنە دان و هندەك ژی رێ پێناهێنە دان.

بۆ نموونە:

((...$\emptyset$ دێ هێتە ناڤ مالا مە.)) ( محمد سليم سوارى: ١٩٨٣: ١٢)

پەیڤا ژێ بری = ژنا وی

((بالیفك دانا سەر چوکێت خو.. هەر دوو زەمدکێت خو دانانە سەر $\emptyset$...)) ( محمد سليم سوارى: ١٩٨٣: ٧)

پەیڤا ژێ بری = بالیفك

### ٣- جھ نشینی -*Substitution*

بریتیە ژ دانانا رەگەزەکی ل جهێ رەگەزەکێ دیتر و ئەو پێکهاتا کو ئەڤ جھ نشینیە تێدا رووی ددەت د رێزمانێ دا ب چارچووڤێ جھ نشینی دهێتە نیاسین. (ابراهیم چگنی: ١٣٨٢: ٤٣٣)

**بۆ نموونە:**

(( ما دێ چ لێ کەن.)) ( محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ١٠)

(ێ) ل شوینا (وی = تەرمێ عەبدالی) هاتییە.

((سەیدا تە های ژێ هەیە.)) (محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ١٣)

(ێ) ل شوینا (وی = ئاغای) هاتییە.

### ٤- ئامرازێن پێوەندیێ - *Conjunctives*

ئەڤ ئامرازە پشکێن دهێتێن دەقی مینا (شرۆڤەکرن، بەلاڤکرن و یانژی زێدەکرن)ێ ب پشکێن بووری یێن دەقی ڤە گرێ ددەن، بشێوەیەکی کو پێوەندییەکا رێکخستی دناڤبەرا رەگەزێن جۆراوجۆرێن زنجیرا ئاخفتنێ دا پەیدا دبیت و رولێ خو د پێکڤەگرێدانا دەقی دا دبینیت. (مهران مهاجری:١٣٧٦ :٦٧) ب واتایەکا دیتر ئەڤ ئامرازە ب ئێك ژ سێ ئەرکێن پێوەندی، گرێدان و گەهاندنێ - لڤێرێ مە زاراڤێ ئامرازێن پێوەندی بۆ هەر سێ ئەرکان بکار ئینایە - رادبن و ب هاریکاریا وان زنجیرا ئاخفتنێ پێکڤە دهێتە گرێدان. سەرەرای ڤێ چەندێ ئەڤ ئامرازە د ناڤ خوە دا ب چەندین ئەرکێن جیاواز رادبن لێ هەمی پێکڤە د ئەرکێ پێکڤە گرێدانا رەگەزێن دناڤ دەقی دا دگەهنە ئێك. ئامرازێن پێوەندی ژی بریتینە ژ:

١- زێدەکرن - Additive

٢- هویی - Causative

٣- رەت کرن (ڤبیرهینان) - Adversative

٤- دەمی - Temporal

٥- ئەگەری - Conditional

٦- شرۆڤەكارى - Illustrative
٧- تايبەتى – Specifiying
٨- د سەر هندێرا، سەرەرا - Concessive (لطف الله يار محمدى: ١٣٨٣: ٥٩)

بۆ نموونه :

زێدەكرن:

((ئاغاى تزبيكێت خو ددەستىَ خو گرتن و بەريكا كورێ خو كەت.))

(محمد سليم سوارى: ١٩٨٣: ١١)

هويى:

((ئەز دێ تە كوژم مانێ عەبدال ل سەر بەختێ من بوو.))

( محمد سليم سوارى: ١٩٨٣: ١١)

(( ئەرێ دێ باوەر كەن چنكو نوكه فەقێ ل گوندى رەڤييه.))

(محمد سليم سوارى: ١٩٨٣: ٩)

رەت كرن (ڤبيرهينان):

((بەلێ تە نەگوت كێ عەبدال كوشت.)) (محمد سليم سوارى: ١٩٨٣: ١١)

((ل دەرڤەى رێكێ دچوو بەلێ گەلەكێ بلەز بوو.))

( محمد سليم سوارى: ١٩٨٣: ١٢)

دەمى:

((دەمێ ئاغاى ئەو ئاخفتن ل گەل مرێبايەكێ خو دكرن، ل ناڤ كوسكا كاركا، سوفى قادرى بۆ مەلاى ئاڤ ل تەرمێ عەبدالى دكر.))

( محمد سليم سوارى: ١٩٨٣: ١٣)

((تا وێ رۆژێ، هەكو كورێ من يێ بچويك سەرێ كورێ وى شكاندى، هاتە سەر قەسرا من.))

( محمد سليم سوارى: ١٩٨٣: ٧)

شرۆڤەكارى:

((دێ سویند خون کو ل ناڤ سپیندارا فەقێ حەسەنی ب جفتێ ئەو کوشت.))

( محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ١١)

(( ئاغای زانی کو ئەو یێت تەرمێ عەبدالی دشوون.))

( محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ١٢)

**ئەگەری:**

((هەکە فەقێ وەنەکربا بۆ دا ل گوندی دەرکەڤت و چت.))

( محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ١٢)

### ٥- پێکڤەگرێدانا پەیڤی – *Lexical cohesions*

پێکڤەگرێدانا پەیڤی بۆ پەیوەندیا چەمکی د ئاستێ پەیڤێدا دزڤریتەڤە ، واتە پێوەندیا واتایی یا دناڤبەرا پەیڤان دا دبیتە ئەگەر کو ئەو پەیف پێکڤە بهێنە گرێدان و بڤی رەنگی پێکڤەگرێدانا پەیڤی دناڤ وی دەقی دا پەیدا دبیت. لدویف وێ یەکا کو ئەڤ پەیڤە تێدا دەردکەڤن ئەم دشێین دوو جۆر پێکڤەگرێدانان دیار بکەین ب واتایەکا دی پێکڤەگرێدان دناڤ دوو ئاستان دا پەیدا دبیت (ناڤ رستێ) و (دەرڤەی رستێ). بڤی رەنگی ((ئەگەر هات و مە بڤێت ڤەکۆلینەکا دیسکۆرسی یا دەقی بکەین پێتڤییە بتنێ پێوەندیا واتایی یا دەرڤەی رستێ وەربگرین لێ ئەگەر مە بڤێت ڤەکۆلینەکا شێوازناسی ئەنجام بدەین پێتڤییە زێدەباری پێوەندیا دەرڤەی رستێ پێوەندیا ناڤ رستێ ژی وەربگرین)) (کورش طارمی: ٢٠٠٨) لێ چونکی ڤەکۆلینا مە بتنێ لایەنێ دیسکۆرسێ بخوە ڤە دگریت لەوا ئەم لڤێرێ بتنێ پێوەندیا پەیڤی د ئاستێ دەرڤەی رستێ دا وەردگرین. پێوەندیا واتایی دناڤبەرا پەیڤان دا دبیتە چەندین جۆر، لڤێرێ دێ هەولێ دەین باسێ هندەك ژ وان بکەین:

١- دووباره کرن - *Repetition*

ئەڤ پێوەندییە لوی دەمی دروست دبیت دەمێ دناڤ دەقی دا پەیڤەك وەك خوە بهێتە دووبارەکرن واتە ژلایێ دەنگی و واتاییڤە چ جیاوازی دناڤبەرا واندا نەبیت.

**بۆ نموونە:**

((سەیدا توڤێ بەلکی چو جاران شین نابت. سەیدا خو نەشارەزا نەکە.)) (محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ١٣)

**٢- هەڤ دەنگ – *Homophony***

دوو پەیڤ لوی دەمی ب هەڤ دەنگ دهێنە نیاسین دەمێ ژ لایێ دەنگی ڤە وەکو ئێك بن لێ ژلایێ واتایی ڤە د جیاواز بن. ئەڤ جۆرە پێوەندییە د هونەرێ رەوانبێژی دا ب (رەگەزدۆزی یا تەواو) دهێتە نیاسین. (لاینز) بۆ هەڤ دەنگیێ سێ مەرجان دیار دکەت:

ا- پەیڤان ژ لایێ واتایێ ڤە پێوەندی ب هەڤرا نینە.

ب- شێوێ پەیڤان وەکهەڤە.

پ- شێوێن وەکهەڤ ژ لایێ رێزمانی ژی یەکسانن. (جان لاینز: ١٣٨٣: ٨٧)

**بۆ نموونە:**

((دا عەبدالك بو وان ببیتە نڤشتوك .....تفەنگا وی یا د دەستی دا.)) (محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ٨)

((هەکو کورێ من یێ بچویك سەرێ کورێ وی شکاندی هاتە سەر ڤەسرا من.)) (محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ٧)

**٣- هەڤ واتا - *Synonymy***

ئەڤ پێوەندیە لوی دەمی پەیدا دبیت دەمێ دوو پەیڤ بشێن دناڤ ئێك پێکهاتە دا لشوینا هەڤدوو بهێن ، بێی کو کاریگەرییەکا مەزن بکەنە سەر واتا وێ رستێ ، لێ دراستی دا دناڤ چ زمانەکی دا هەڤ واتایی یا تەواو نینە، واتە چ جووت پەیڤەك مە نینن کو بشێن د هەمی رستێن زمانیدا لشوینا هەڤدوو بهێنە بکار ئینان بێی کو واتایێ بگوهورن. (فرانك. ر. پالمر: ١٣٨١: ١٠٧)

**بۆ نموونە:**

((بۆ ئەز خولام؟

پاشی دێ زانی.

ئەزبەنی بەری نڤێژا ئێڤارێ من لنك ئاشی دیت)). (محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ١٢)

**٤- دژ واتا - *Antonymy***

دڤێ پێوەندیێ دا هەر دوو پەیڤان واتایێن هەڤدژ هەنە، دژواتا د سیمانتیکێ دا ب (*Opposition*) دهێتە نیاسین.

**بۆ نموونە:**

((سەیدا هەکە هەمی وە بێژن ..تو وە نەبێژە.)) ( محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ١٤)

((کورێ ئاغای دەرکەت و پشتی جگارەکێشانەکێ هاتە ژوور.)) (محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ٨)

**٥- هایپۆنیم – *Hyponymy***

ئەڤ پێوەندیە لوی دەمی دروست دبیت دەمێ چەمکەك بشێت ئێك یانژی چەند چەمکێن دی بخوە ڤە بگریت ب واتایەکا دی ((هایپۆنیم پێوەندییەکە دناڤبەرا تایەکێ گشتی و ژێر تاییێن وێ دا.)) (کورش صفوی: ١٣٨٣: ٩٩)

**٦- پشك و گشت - *part - whole***

د ڤێ پێوەندیێ دا، مصداقێ ئێك ژ هەر دوو پەیڤان پشکەکە ژ کومەلەکێ کو مصدڤا پەیڤا دیتر پێك دئینیت. (کورش طارمی: ٢٠٠٨) بڤێ واتایێ کو مصداقێ پەیڤەکێ، مصداقێ چەندین پەیڤێن دیتر بخوە ڤە دگریت و مصداقێن ڤان پەیڤان پشکەکە ژ مصداقێ وێ پەیڤا سەرەکی. بڤی رەنگی پشك و گشت ژ هایپۆنیمێ جۆدایە (چونکی د پشك

و گشت دا ئەو پەیڤ پشکەکە ژ پەیڤا دی لێ د هایپۆنیمێ دا ئەو جۆرەکە ژ پەیڤا دی.) (کورش صفوی: ١٣٨٣: ١٠٤)

**بۆ نموونە:**

((چوو بەر دەرگەهێ کوچکێ و بەرێ خو دا کولانا گوندی.)) (محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ٧)

((فەقێ هەر دوو تەپێت خو ل سەرێ خو دان و کزگریك کەتە د گەوریێ دا.)) (محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ٩)

**٧- لێکچواندن - *Simile***

لێکچوون بریتییە ژ لێکچواندنا پەیڤەکێ ب پەیڤەکا دیتر کو د تایبەتمەندیەکێ دا هەڤپشك بن.

**بۆ نموونە:**

((رها ئەنیا ئاغای یا لێ بیە گرێ ، دێ بێژی دیپشکەکی یێ پێڤەدای.)) ( محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ٧)

## زمانڤانیا هویر و گر *Micro linguistics & Macro linguistics*

زمانڤانی دابەشی دوو ئاستان دبیت ئاستێ هویر و ئاستێ گر(زمانڤانی د ئاستێ گر دا هەولێ ددەت پێوەندیا گشتی یا زمانی دگەل ئەزموونێن دەرڤەی زمانی و تایبەتمەندیێن فیزیکی یێن دەنگی و نڤێسینێ دیار بکەت لێ زمانڤانی د ئاستێ هویر دا ب کارێ شرۆڤەکرنا زمانی رابیت و هەول ددەت پترین هویرکاری یێن زمانی وەربگریت.) (ابراهیم چگنی: ١٣٨٢: ٢٧٨) بڤی رەنگی د زمانڤانیا گر دا ژ لایەکیڤە پێوەندیا دەڤی دگەل فاکتەرێن مینا کەلتوور، لایەنێ دەروونناسی و...هتد دهێتە وەرگرتن و ژلایەکێ دیترڤە پێوەندیا دناڤبەرا سەرجەمێ رەگەزێن پێکهێنەرێن دەڤی دهێتە وەرگرتن لێ د زمانڤانیا هویر دا پێکهاتا سیستەمێ زمانی د ئاستێن هویرتر مینا فۆنۆلۆژی، مۆرفۆلۆژی و سینتاکسێ دهێتە وەرگرتن.

ب هەمان شێوە ئەم دشێن شرۆڤەکرنا دیسکورسێ ل دوو ئاستان دا ئەنجام بدەین، ئاستێ گر و ئاستێ هویر، دئاستێ گر دا ڤەکۆلینێ ل تایبەتمەندیێن گشتی یێن دەقی دکەین و ل ئاستێ هویر دا ڤەکۆلینێ ل تایبەتمەندیێن هویرتر واتە ئاستێ رستێ دکەین. (آزاده نعمتی: ۱۳۸٦: ۱۷۵)

**شێوێ شرۆڤەکرنا داتایان د ئاستێ گر دا:**

د ڤی ئاستی دا ئەم دێ فاکتەرێن پێکڤەگرێدانا چیرۆکێ وەرگرین و هەر وەکی هاتییە گوتن ئەم بۆ ڤێ چەندێ ژی دێ مفای ژ بیر و بوچوونێن (هالیدای و روقەیا حەسەن)ێ وەرگرین، فاکتەرێن پێکڤەگرێدانێ ژی ئەڤە بوون:

١- لێ زڤرین
٢- جهـ نشینی
٣- ژێ برن
٤- ئامرازێن پێوەندیێ
٥- پێکڤەگرێدانا پەیڤی

**شێوێ شرۆڤەکرنا داتایان د ئاستێ هویر دا:**

د شرۆڤەکرنا ئاستێ هویرێ چیرۆکێدا دا دێ هەولێ دەین جۆرێ رستان ژلایێ پێکهاتە و مەبەست و شێوەی ڤە وەربگرین، ئەو جۆر ژی بریتینە ژ:

١- **رستا سادە**

**بۆ نموونە:**

((نوکە مرۆڤێت وی ژی گەهشتینە گوندی.)) (محمد سلیم سواری: ۱۹۸۳: ۱۱)

٢- **رستا نەسادە**

**بۆ نموونە:**

(( فەڤێ هەر دوو تەپێت خو لسەرێ خو دان و کزگریك کەتە دگەوریێ دا.)) (محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ٩)

**٣- رستا راگەهاندنا رووت**

**بۆ نموونە:**

((نێ عەبدال ژی چوو... خاترا خو ژ دنیایێ خازت.)) (محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ١٠)

**٤- رستا راگەهاندنا پرسیاری**

بۆ نموونە:

(( بابو کێ ژ وە فەق حەسەن دیتییە؟)) ( محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ١٢)

**٥- رستا راگەهاندنا سەرسورمان - هەیبەتی**

**بۆ نموونە:**

((کێ، من عەیالێ عەبدالی هێتیم کر؟.)) (لدویف کردێن ئاخافتنێ) (محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ٩)

٦- رستا ئەمری - فەرمان

**بۆ نموونە:**

((ئەو زەلامێت نوکە ل گوندی بلا بچن توربەکی بکولن، مەلا ژی بلا بشوت و کفن کەت)) . (محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ١٠)

**٧- رستا مەرجی:**

**بۆ نموونە:**

(( هەکە نەمرم و ساخ بم، دێ ژنا عەبدالکێ دەمە شوی)). (محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ٨)

((هەکە من ل ناڤ مالا خو نە حەواند بانە ..کی دا وان حەوینت)). (محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ٧)

**٨- رستا بکەر دیار**

**بۆ نموونە:**

((سوفی...مه یا ڤرێ کریه دویف مرۆڤێت وی را هنده دێ هێن.))
(محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ١١)

٩- رستا بکەر نەدیار

**بۆ نموونە:**

((ئەز بەنی تو یێ حەڤی...مرۆڤەکێ وەك عەبدالی بهێته کوشتن ..و کەس چو ژێ نەزانیت.)) (محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ١٠)

١٠- رستا تەواو

**بۆ نموونە:**

((سەیدا خو نەشارەزا نەکە.)) (محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ١٣)

١١- رستا نەتەواو

**بۆ نموونە:**

((هنده نڤێژا ئێڤاریه نوکه هەر ل گوندی یە.)) (محمد سلیم سواری: ١٩٨٣: ٨)

**شرۆڤەکرنا داتایان**

**١- شرۆڤەکرنا فاکتەرێن پێکڤەگرێدانێ د ئاستێ گر دا**

ئەنجامێن شرۆڤەکرنا فاکتەرێن پێکڤەگرێدانێ کو بریتی بوون ژ (لێ زڤرین، ئامرازێن پێوەندی، ژێ برن، جه نشینی، پێکڤەگرێدانا پەیڤی) د خشتێ ژمارە (١) دا هاتینە نیشان دان:

| پێکڤەگرێدانا چیرۆکێ د ئاستێ گر دا | | |
|---|---|---|
| جۆر | ژمارە | رێژە |
| لێ زڤرین | ٣٠٦ | ٥١ |
| پێکڤەگرێدانا پەیڤی | ١١٣ | ١٨ .٨ |
| ئامرازێن پێوەندی | ٨٢ | ١٣ .٦ |

| ژێبرن | ٨٨ | ١٤ .٦ |
|---|---|---|
| جهـ نشینی | ١١ | ١ .٨ |
| کۆ | ٦٠٠ | ٪١٠٠ |

خشتێ ژماره (١)

هەر وەکی د خشتەی دا هاتیه نیشان دان دناڤ چیرۆکێدا (٦٠٠) پێکڤەگرێدان هەنە کو ئەڤە ژی ژمارەیەکا مەزنە و نیشانا پێوەندی و پێکڤەگرێدانەکا تەواوە دناڤبەرا رەگەز و پشکێن پێکهێنەرێن چیرۆکێ دا.فاکتەرێ (لێ زڤرین)ێ مەزنترین رێژە د پێکڤەگرێدانێ دا هەیە و دبیتە نیڤا سەرجەمێ پێکڤەگرێدانێن چیرۆکێ. پشتی وێ فاکتەرێن (پێکڤەگرێدانا پەیڤی) ب رێژا (٨. ١٨) ل پلا دووێ ، فاکتەرێ (ژێ برن) ب رێژا (٦. ١٤) ل پلا سێێ ، فاکتەرێ (ئامرازێن پێوەندی) ب رێژا (٦. ١٣) ل پلا چارێ و فاکتەرێ (جهـ نشینی) ب رێژا (٨. ١) ل پلا پێنجێ دهێت بڤی رەنگی فاکتەرێ (جهـ نشینی) کێمترین پشکداری د ڤێ چیرۆکێ دا هەیه.هەر وەکی بەری نهو هاتیه گوتن هەر ئێك ژ ڤان فاکتەران ژی دابەشی چەندین تایێن دی دبن، لەوا لخوارێ دێ هەولێ دەین ئەنجامێن وان ژی دیار بکەین.

**فاکتەرێن لێ زڤرینێ**

ئەنجامێن شرۆڤەکرنا فاکتەرێن لێ زڤرینێ کو بریتی بوون ژ (نیشانێن رێکەفتنێ، نیشانێن ئاماژێ، جهناڤ، هەڤالناڤێ پلەیی، هەڤالناڤێ نیاسینێ) د خشتێ ژماره (٢) دا هاتینە نیشاندان:

| فاکتەرێن لێ زڤرینێ | | |
|---|---|---|
| جۆر | ژماره | رێژه |
| نیشانێن رێکەفتنێ | ١٣٢ | ٤٤ .٧ |
| جهناڤێن کەسی | ١٤٣ | ٤٨ .٤ |

| نیشانێن ئاماژێ | ١٦ | ٥.٤ |
| --- | --- | --- |
| هەڤالناڤێ نیاسینێ | ٤ | ١.٣ |
| هەڤالناڤێ پلەیی | ٠ | ٠ |
| کۆ | ٢٩٥ | ٪١٠٠ |

خشتێ ژمارە (٢)

شرۆڤەکرنا داتایان نیشان ددەن کو (جهناڤێن کەسی) ب ژمارا (١٤٣) و رێژا (٤.٤٨) مەزنترین رێژە هەیە و پرانیا ڤان جهناڤێن کەسی ژی (من) و(ئەز) و (ئەو) ن، کو ئەڤ رێژەیە ژی دگەل سرۆشتێ چیرۆکێ دا دگۆنجیت چونکی رۆلێ (ڤەگێر)ی و کەسایەتیا سەرەکی واتە (ئاغا)ی یا دیارە لەوا دەمێ ڤەگێر دئاخڤیت مفای ژ جهناڤێ (ئەو) وەردگریت هەر وەسا چونکی کەسایەتیا دووێ د ناڤ رویدانان دا یێ ئامادە نینە لەوا دەمێ سەبارەت وی دهێتە ئاختفتن ب هەمان شێوە مفا ژ جهناڤێ (ئەو) دهێتە وەرگرتن و هەروەسا چونکی کەسایەتیا سەرەکی مفایەکێ زۆر ژ مۆنۆلۆگێ وەردگریت لەوا رێژا بکار ئینانا (ئەز) و (من) ژی بەرز بوویە.

پشتی جهناڤان (نیشانێن رێکەفتنێ) ب ژمارا ( ١٣٢) و ب رێژا (٤٤.٧) ل پلا دووێ دهێت لێ لدویف سرۆشتێ زمانی پێتڤی بوو کو مەزنترین رێژە یا نیشانێن رێکەفتنێ با لێ وەسان نینە،چونکی د کرمانجی یا سەری دا نیشانێن رێکەفتنێ بتنێ دگەل گرۆپێ (ئەز) دا دهێن و دگەل گرۆپێ (من) دا ناهێن لەوا رێژا وان کێمترە.پاشان فاکتەرێ (نیشانێن ئاماژێ) ب رێژا (٥.٤) ل پلا سیێ و فاکتەرێ (هەڤالناڤێ نیاسینێ) ب رێژا (١.٣) ل پلا چارێ دهێت،بڤی رەنگی دیار دبیت(هەڤالناڤێ نیاسینێ) کێمترین پشکداری د چیرۆکێ دا هەیە و (هەڤالناڤێ پلەیی) چ پشکداری نینە.

٢- ئامرازێن پێوەندیێ

ئەنجامێن شرۆڤەکرنا ئامرازێن پێوەندیێ کو بریتی بوون ژ (زێدەکرن، هویی، رەت کرن، دەمی، شرۆڤەکاری، ئەگەری، تایبەتی، سەرەرا) د خشتێ ژمارە (٣) دا هاتینە نیشاندان:

| ئامرازێن پێوەندیێ | | |
|---|---|---|
| جۆر | ژمارە | رێژە |
| زێدەکرن | ٤٢ | ٥١ .٢ |
| هویی | ٥ | ٦ .٠٩ |
| رەت کرن (ڤبیرهینان) | ٥ | ٦ .٠٩ |
| دەمی | ١١ | ١٣ .٤ |
| شرۆڤەکاری | ٣ | ٣ .٦ |
| ئەگەری | ١٦ | ١٩ .٥ |
| تایبەتی | ٠ | ٠ |
| سەرەرا | ٠ | ٠ |
| کۆ | ٨٢ | ٪١٠٠ |

خشتێ ژمارە (٣)

فاکتەرێ (زێدەکرن) مەزنترین رێژە واتە (٢. ٥١) هەیە کو ئەڤە ژی دگەل سرۆشتی دەقێن درێژ دا دگۆنجیت تاوەکو رەگەزێن پەیڤ، گرێ و رستان ب هەڤرا گرێ بدەت و بڤی رەنگی دەق وەکی زنجیرەکێ یا پێکڤە گرێدای بیت. پاشان (ئەگەری) ب رێژا (٥. ١٩) ل پلا دووێ دهێت کو ب هەمان شێوە ئەو ژی دگەل سرۆشتێ چیرۆکێ دا کو پتر مۆنۆلۆگا ئاغایە و نەخشە و پیلانان دکێشیت دگۆنجیت.پاشان فاکتەرێن(دەم) ب رێژا (٤. ١٣) ل

پلا سیێ و فاکتەرێن(هویی) و (رەت کرن) ب رێژێن (٩٠. ٦) ل پلا چارێ دهێن. هەروەسا فاکتەرێ (شرۆڤەکاری) ب رێژا (٦. ٣) کێمترین پشکدای هەیە و فاکتەرێن (تایبەتی)و (سەرەڕا) چ پشکداری د دەقی دا نینە.

**٣- فاکتەرێن پەیڤی:**

ئەنجامێن شرۆڤەکرنا فاکتەرێن پەیڤی کو بریتی بوون ژ (دووبارەکرن، هەڤ واتا، دژ واتا، هەڤ دەنگ، پشك و گشت، هایپۆنیم، لێکچواندن) د خشتێ ژمارە (٤) دا هاتینە نیشاندان:

| فاکتەرێن پەیڤی. | | |
|---|---|---|
| جۆر | ژمارە | رێژە |
| دووبارە کرن | ٧٥ | ٦٦ .٣ |
| هەڤ واتا | ٧ | ٦ .١ |
| دژ واتا | ١٢ | ١٠ .٦ |
| هەڤ دەنگ | ٧ | ٦ .١ |
| پشك و گشت | ٩ | ٧ .٩ |
| هایپۆنیم | ٠ | ٠ |
| لێکچواندن | ٣ | ٢ .٦ |
| کۆ | ١١٣ | ٪١٠٠ |

خشتێ ژمارە (٤)

(دووبارەکرن) ب رێژا (٣. ٦٦) ل پلا ئێکێ دهێت کو چەندین جاران پتر ژ فاکتەرێن دی ،هەر چەند دووبارە کرن دناڤ دەقی دا ب کارەکێ لاواز دهێتە نیاسین لێ نڤیسەرێ چیرۆکێ بۆ مەبەستا پتر جەختکرن لسەر هندەك بابەتان مفا ژ فاکتەرێ

دووباره کرنێ وەرگرتیه .ئەڤ دووبارەکرنه دناڤ ڤی دەقی دا خوینەری بێزار ناکەت لەوا ئەڤ دووباره کرنه شیایه ب ئەرکێ خوەیێ پێکڤەگرێدانێ رابیت بێی کو لاوازیێ بێخیته دناڤ دەقی دا.پاشان فاکتەرێ (دژ واتا) ب رێژا (٦. ١٠) ل پلا دووێ و فاکتەرێ (پشك و گشت) ب رێژا (٩. ٧)ل پلا سیێ و (هەڤ واتا) و (هەڤ دەنگ) ب رێژا (١. ٦) ل پلا چارێ دهێن. هەروەسا فاکتەرێ (لێکچواندن) ب رێژا (٦. ٢) کێمترین پشکداری هەیه و فاکتەرێ (هایپۆنیم) چ پشکداری د دەقی دا نینه.

**٢- شرۆڤەکرنا فاکتەرێن پێکڤەگرێدانێ د ئاستێ هویر دا**

کۆیا وان رستێن کو د چیرۆکێ دا هاتینه بکار ئینان (٢٢٩) رستەنه. لدویف وێ دابەشکرنا مە د پشکا تیۆری دا بۆ پێکهاتا سینتاکسی یا رستان ئەنجام دای رێژا هەر جۆرەکی بڤی شێوێ خوارێیه:

| پێکڤەگرێدانا چیرۆکێ د ئاستێ هویر دا | | |
|---|---|---|
| پێکهاتا سینتاکسی | ژماره | رێژه |
| راگەهاندنا رووت | ١٤٤ | ٦٢ .٨ |
| راگەهاندنا پرسیاری | ٤٤ | ١٩ .٢ |
| رستا راگەهاندنا سەرسوورمان | ٢٤ | ١٠ .٤ |
| فەرمان | ١٠ | ٤ .٣ |
| مەرجی | ٧ | ٣ .٠٥ |
| تەواو | ١٨٥ | ٨٠ .٧ |

| نەتەواو | ٤٤ | ١٩ .٢ |
| --- | --- | --- |
| سادە | ١٦٢ | ٧٠ .٧ |
| نەسادە | ٦٦ | ٢٨ .٨ |
| بکەر دیار | ٢٢٧ | ٩٩ .١ |
| بکەر نەدیار | ٢ | ٠ .٨ |

**خشتێ ژمارە (٥)**

**هەروەکی دبینین رێژا رستێن (سادە) گەلەك پترە ژ رستێن (نەسادە) کو ئەڤە ژی هەتا رادەیەکی ناگۆنجیت دگەل سرۆشتێ زمانێ رۆژانە دا چونکی د زمانێ رۆژانە دا پتر مفا ژ رستێن نەسادە دهێتە وەرگرتن لەوا دەق ژ ڤی لایڤە ژ ئاخفتنا رۆژانە دوور دکەڤیت. پێکهاتا دووێ ژ رستان، رستێن بکەر دیار و بکەر نەدیارە کو دڤێ چیرۆکێ دا رێژا رستێن بکەر دیار گەلەك پترە ژ رستێن بکەر نەدیار کو دەق ژ ڤی لایڤە گەلەك ل زمانێ رۆژانە نێزیکە چونکی د زمانێ رۆژانەیێ کوردی دا رێژا رستێن بکەر دیار پترە ژ رێژا رستێن بکەر نەدیار. پێکهاتا سیێ ژ رستان، رستێن تەواو و نەتەواوە کو دڤێ چیرۆکێ دا رێژا رستێن تەواو گەلەك پترە ژ رستێن نەتەواو ئەڤە ژی نیشانا هەبوونا کار و چالاکیێ یە دناڤ چیرۆکێ دا و هاتنا رستێن سادە و تەواو ب هەڤرا بەلگەیە بۆ هندێ کو نڤیسەری هەول دایە ب مفا وەرگرتنا ژ ڤان هەر دوو پێکهاتان پتریا رویدانان ب کێمترین کەرەستە دەرببریت کەواتە مفا ژ کورتبریێ هاتییە وەرگرتن. پێکهاتا چارێ یا رستان، رستێن (راگەهاندنا رووت، راگەهاندنا پرسیاری، راگەهاندنا سەرسوورمان، فەرمان و مەرجی) نە کو رێژا رستێن راگەهاندنا رووت پترە ژ رستێن دی.ئەڤە ژی هەر وەکی بەری نهو هاتیە گوتن دگەل سرۆشتێ چیرۆکێ دا کو ڤەگێر هەیە و پتر مۆنۆلۆگە**

دگونجیت چونکی ل ڤی دەمی دا پتر مفا ژ رستێن راگەهاندنێ دهێتە وەرگرتن.

ژ خشتێن ژمارە (٦) هەتا (٩) دشێین رێژا هەر پێکهاتەکێ و جیاوازییا وان دگەل ئێك دا بزانین، ژ بۆ هندێ کو بابەت گەلەك درێژ نەبیت بتنێ دێ خشتان رێز کەین:

| پێکهاتا سینتاکسی | ژمارە | رێژە |
|---|---|---|
| بکەر دیار | ٢٢٧ | ٩٩ .١ |
| بکەر نادیار | ٢ | ٠ .٨ |
| کۆ | ٢٢٩ | ٪١٠٠ |

خشتێ ژمارە (٦)

| پێکهاتا سینتاکسی | ژمارە | رێژە |
|---|---|---|
| سادە | ١٦٢ | ٧٠ .٧ |
| نەسادە | ٦٦ | ٢٨ .٨ |
| کۆ | ٢٢٩ | ٪١٠٠ |

خشتێ ژمارە (٧)

| پێکهاتا سینتاکسی | ژمارە | رێژە |
|---|---|---|
| تەواو | ١٨٥ | ٨٠ .٧ |
| نەتەواو | ٤٤ | ١٩ .٢ |
| کۆ | ٢٢٩ | ٪١٠٠ |

خشتێ ژمارە (٨)

| پێکهاتا سینتاکسی | ژمارە | رێژە |
|---|---|---|
| راگەهاندنا رووت | ١٤٤ | ٦٢ .٨ |

| راگەهاندنا پرسیاری | ٤٤ | ١٩. ٢ |
|---|---|---|
| راگەهاندنا سەرسوورمان | ٢٤ | ١٠. ٤ |
| فەرمان | ١٠ | ٤. ٣ |
| مەرجی | ٧ | ٣. ٠٥ |
| کۆ | ٢٢٩ | ٪١٠٠ |

خشتێ ژمارە (٩)

**ئەنجام**

شرۆڤەکرنا دەقێ چیرۆکێ د ئاستێ گر دا نیشان ددەت کو دناڤبەرا فاکتەرێن پێکڤەگرێدانێ دا فاکتەرێ (لێ زڤرینێ) ل پلا ئێکێ دهێت و مەزنترین رێژە واتە (٩. ٥١٪) هەیە و دناڤ ڤی فاکتەری ژی دا جهناڤێن کەسی مەزنترین رێژا (٤. ٤٨٪) هەیە،کو ئەڤە ژی خالەکا هەڤپشکە دگەل ئاخفتنا رۆژانە یا زمانێ کوردیدا و دناڤ ڤان جهناڤان ژی دا بکارئینانا رێژەیا زۆرا (من) و (ئەز) نیشانا دووپات کرنێ یە ل سەر ئاخفتنکەری کو ئەو ژی کەسایەتیا سەرەکی یا چیرۆکێ یە.ب هەڤکاریا ڤی فاکتەری ڤەگێرێ چیرۆکێ هەولێ دایە پتر لایەنێ دەروونی یێ (ئاغای = کەسایەتیا سەرەکی) نیشان بدەت.ل پلا دووێ فاکتەرێ (پێکڤەگرێدانا پەیڤی) دهێت کو رێژا (٨. ١٨٪) هەیە و تێدا دووبارەکرنێ رێژا (٣. ٦٦٪) هەیە و سەرەرای هندێ کو دووبارەکرن ب خالەکا لاوازیێ دهێتە هژمارتن لێ نڤیسەری هەولێ دایە ب مفا وەرگرتن ژ هەمان فاکتەر پێکڤەگرێدانێ د ناڤ دەقی دا دروست بکەت و دووپاتیێ ژی لسەر بابەتێن گرنگ بکەت ئەڤە ژی وە دکەت کو خوینەر هەست ب لاوازیێ نەکەت.

شرۆڤەکرنا دەقی د ئاستێ هویر دا نیشان ددەت کو رستێن سادە پتر ژ رستێن نەسادە هاتینە بکار ئینان، ئەڤە ژی دگەل ئاخفتنا رۆژانە دا ناگونجیت چونکی دناڤ ئاخفتنا رۆژانەدا پتر رستێن نەسادە دهێنە بکار ئینان.لێ هەر ئەڤ رستێن سادە دگەل رێژا زۆرا رستێن تەواو کو رێژا

(٨٠,٧٪) هەیە و رستێن راگەهاندنا رووت کو رێژا (٨. ٦٢٪) هەیە نیشانا بکارئینانا کورتبریێ نە دناڤ دەقی دا،ئەڤە ژی دگەل بنەمایێن هەڤکاریا گرایسی دا دگونجیت.هەر وەسان رێژا رستێن (بکەر دیار) ژی (١. ٩٩٪) ــە کو دگەل پێکهاتا رستا زمانێ رۆژانە یێ کوردی دا دگونجیت.

کەواتە ب شێوەیەکێ گشتی ئەڤ چیرۆکە ل ئاخفتنا رۆژانەیا خەلکی نیزیکە و دوورە ژ هونەرکاریا ئەدەبی.

**ژێدەر:**

**ب زمانێ کوردی :**

١. عەبدولواحید موشیر دزەیی، رەهەندی دەروونی لە بواری راگەیاندندا، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٥.

٢. محمد سلیم سواری، مزگینی، چاپا ئێکێ ، دار آفاق عربیه، بەغدا، ١٩٨٣.

**ب زمانێ فارسی:**

١. ابراهیم چگنی، فرهنگ دائره المعارف زبان و زبانها ،چاپ اول، نشر بهنام، تهران، ١٣٨٢ (٢٠٠٣).

٢. آدریان اکمیاج و دوستان، زبانشناسی، ت: علی بهرامی، ویراست چهارم، نشر رهنما، تهران، ١٣٨٢ (٢٠٠٣).

٣. آزادة نعمتی، تجزیه و تحلیل گفتمانی — دستوری منظومەی صدای پای آب سهراب سپهری، مجله زبان و ادبیات فاری دانشگاه سیستان و بلوچستان، سال پنجم، بهار و تابستان ١٣٨٦ (٢٠٠٧).

٤. جان لاینز، مقدمەای بر معناشناسی زبان شناختی، ت: حسین واله، چاپ اول، نشر گام نو، تهران، ١٣٨٣ (٢٠٠٤).

٥. جلال رحیمیان، تجزیه و تحلیل گفتمانی داستان مدیر مدرسه در سطح خرد و کلان ، نشریەی ادبیات و علوم انسانی دانشگاه شهید باهنر کرمان، دورەی جدید، شماره پیاپی ١٢ (پیاپی ٩)، زمستان ١٣٨١ (٢٠٠٢).

٦. رابرت لارنس ترسك، مقدمات زبان شناسی، ت: فریار اخلاقی، چاپ اول، نشر نی، تهران، ١٣٨٠ (٢٠٠١).

۷. رومینا یمینی، بررسی عوامل انسجام واژگانی د متون فارسی و تاثیر آن بر درك مطلب زبان آموزان غیر فارسی زبان، کارشناسی ارشد رشته زبانشاسی، دانشگاه شهید بهشتی - دانشکده ادبیات و زبانهای خارجی، اردیبهشت ۱۳۷۸ (۱۹۹۹).
۸. سید محمد حسین معصوم، بررسی تطبیقی ارجاع به عنوان ابزار انسجام متن در فارسی و انگلیسی، کارشناسی ارشد رشته زبانشناسی همگانی، پژوهشگاه علوم انسانی و مطالعات فرهنگی - پژوهشکده زبانشناسی همگانی،شهریور ۱۳۸٤ (۲۰۰۵).
۹. علی صلح جو، گفتمان و ترجمه، چاپ چهارم، نشر مرکز، تهران، ۱۳۸۵ (۲۰۰٦).
۱۰. فرانك ر. پالمر، نگاهی تازه به معنی شناسی، ت: کورش صفوی، چاپ سوم، نشر مرکز، تهران، ۱۳۸۱ (۲۰۰۲).
۱۱. گرور هادسن، مباحث ضروری و بنیادین زبانشناسی مقدماتی، ت: علی بهرامی، چاپ اول، نشر رهنما، تهران، ۱۳۸۲ (۲۰۰۳).
۱۲. کورش صفوی، درآمدی بر معنی شناسی، چاپ دووم، نشرسوره مهر،تهران، ۱۳۸۳ (۲۰۰٤).
۱۳. کورش طارمی و اشرف رحمانی، بکارگیری روابط واژگانی در سبك شناسی و کاربرد آن در شعر نیمایی، ۲۰۰۸/۱۱/۱۹:
http://idochp2.irandoc.ac.ir:800/fulltext15/se/24/24077.pdf
۱٤. لطف الله یار محمدی، گفتمان شناسی رایج و انتقادی، چاپ اول، نشر هرمس، تهران، ۱۳۸۳ (۲۰۰٤).
15. مهران مهاجری و محمد نبوی، به سوی زبان شناسی شعر _ رەیافتی نقش گرا، چاپ اول، نشرمرکز، تهران، ۱۳۷٦ (۱۹۹۷).

**ب زمانێ ئنگلیزی** :

**1. Halliday ,M.A.K.and Hassan,R.Cohesion in English.london,1976.**

**2. Halliday ,M.A.K,An Introduction to functional Grammar,London,1985.**

## ملخص البحث

# تحليل خطابي لقصة (أجير الآغا)
# تحليل على المستويين ـ الكلي و الجزئي



**م. م. عبدالسلام نجم الدين عبدالله**

**قسم اللغة الكردية - كلية التربية — جامعة دهوك**



**هذا البحث، محاولة لدراسة عوامل الانسجام فى داخل النص و على المستويين (الكلي و الجزئي). وقد أجريت هذه الدراسة حسب نظريات العالم اللغوي (هاليداي). وتم الاستفادة من اجراء احصاء كامل لعوامل الانسجام، التي قمنا باظهارها على المستوى الكلي للنص وفي هذا الاثناء تمت الاستفادة من الارجاع على المستوى الكلي اولا، ومن عامل الكلمة ثانياً. ويكون مجموعهما - الارجاع والكلمة - (٨. ٦٩٪) من مجموع انسجام داخل النص.**

**وفي المستوى الجزئي نسبة الجمل الخبرية كانت (٦٢,٨٪) ونسبة الجمل الفعلية (٨٠,٧٪) ونسبة الافعال مبنى للمعلوم كانت (٩٩,١٪) وهذه النسب التي ذكرناها تنسجم مع الكلام اليومي الا ان استخدام الجمل البسيطة والتي كانت نسبتها (٧٠,٧٪) لم تنسجم مع الكلام اليومي وتكون هذه النسبة مع النسب الاخرى سببا للايجاز في النص.**

# Abstract

**Abdusalam Najimaldeen Abdullah**
**Kurdish department – College of Educatir**
**Duhok.- University**

This paper deals with a grammatical-discourse analysis to the story of "Meriba ye Aghay – Tenant of landlord - " on the macro-micro levels in an attempt to deal with the inter-text's cohesion factors on such levels. The study is performed according to the theories of Mac Halliday, the famous linguist. However, a full statistics to cohesion factors is taken into consideration, which is shown on the text's macro-level, duly, taking reference over macro-level and lexical cohesions, resulting in (total score of reference and lexical) 69.8% out of the inter-text's cohesion.

In the micro-level, the ratio of noun-clauses is 62.8%, the verbal clauses 80.7%, and active verbs 99.1%. These ratios harmonize with the vernacular daily language though the usage of simple sentences which rated 70.7% do not harmonize with the daily language, hence the ratio 70.7% with the other ratios create cohesion in a given text.

# بەڵگەنامەکانی کوردستان

**محەمەد عەلی قەرەداغی**

**ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی - هەولێر**

**سەرەتایەکی کورت**

**گەلانی خوداپێداوی جیهان لە بواری کۆکردنەوەی کەلەپوور و بەڵگەنامە و دیکۆمێنتەوە گەلێ کاری گەورەیان ئەنجامداوە و، ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش لەو بوارانەدا کارگەلی گەورە گەورە دەخەنە سەر خەرمانی سامانی نەتەوایەتییان.**

**بەڵام ئێمەی کورد نە دەستخەتخانەمان بۆ کۆکردنەوە و پاراستنی دەستخەتەکانمان هەیە و، نە ئەرشیفی نەتەوایەتیمان بۆ پاراستن و لێکۆڵینەوەی بەڵگەنامەکانمان هەیە و، دەیان و سەدان و هەزاران بەڵگەنامەی پڕ بایەخ و بەسوودمان هەن چاوەڕوانی ئەوەن شتێکیان بۆ بکرێت و سوودی خۆیان ببەخشن.**

**من لە ئاستی خۆمەوە جاروبار لە دەرگای ئەو بابەتانە دەدەم و، هەرجارەی دیارییەك پێشکەشی کتێبخانەی کوردی ئەکەم، ئەم جارەیش بەم بەڵگەنامەیەوە دێمەوە ناو ئەم بابەتە، بەهیوای ئەوەی ئەمە هاندەر بێت بۆ ئەوەی لایەك لەم سامانە پڕبایەخە بکرێتەوە.**

**بەڵگەنامەی کوردستان**

**لەبارەی بەڵگەنامە و ئەو دەقانەوە کە بە بەڵگەنامە دادەنرێن نابێ چاوەڕوانی ئەوەبین دەق و دیکۆمێنتەکان بەزمانی کوردی بن؛ چونکە هەموو دەزانین تەمەنی پەخشانی کوردی ئەوەندە درێژ نییە ئەو جۆرە کارانەی لە کۆندا پێکرابێت.**

بۆیە دەبێ بڵێین: (بەڵگەنامەی کوردستان) واتە ئەو بەڵگەنامانەی بە شێوەیەك لە شێوەکان پێوەندییان بە کوردستان و زانا و ناوداران و کەسایەتییەکانیەوە هەیە، ئەمەیش بە هەر زمانێك بێت کە ئەو مەبەستانەی ئێمەی بەدی هێنا ئەوە بەڵگەنامەی کوردستانە و، لەم دەقانەیش - با لەلای خۆیشمان نەبن - مان زۆر زۆرە و، تەنها بەرنامەی گەنجاوو شیاو و کەسی کارامە و لێهاتوویان دەوێت کاریان بۆ بکەن.

لە وتارێکدا لە ژمارە (١١٦)ی گۆڤاری راماندا[1] یەکەم جار و دواتریش لە بەرگی هەشتەمی بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوەدا بڵاو بووەوە، باسێ گەلێ لە سوود و بایەخی بەڵگەنامەم کرد، هەر بۆ دەرخستنی بایەخی بەڵگەنامە و جۆری بایەخدانی گەلانی دی بە بەڵگەنامە پوختەی سەر وتاری ژمارە (٥٧)ی (گنجینەء اسناد) دەکەم بە کلیلی دەرگای ئەم بابەتە:

"بەڵگەی نەتەوەیی فراوانکردنی فەرهەنگ

بێگومان لەناو سەرچاوە مێژووییەکاندا بەڵگەی نەتەوەیی و مێژوویی خاوەنی ڕەسەنی و بایەخ زۆرن؛ چونکە هەر بەڵگەیەکی ئیداری و دەرباری، یان هەر فرمان و نامەیەکی رەسمی - کە لە پێشینانەوە گەیشتبنە دەستمان - پێوەندییان بە ڕووداوی تایبەتی و دروستەوە هەیە و، لە ئەنجامدا پێوەندییان بە پێشینە و ئێستە و (اثر ومؤثر)ەوە هەیە، جگە لەوەی دەربارەیان دەگوترێت و لە ناوەرۆکیشیان وەردەگیرێت، لەسەر بناغەی بایەخ و ڕەسەنایەتی دامەزراو و پایەدارن. بە پێچەوانەی دەقگەلی کۆنەوە کە ڕەنگە کوژاندنەوە و چاککردن و دەستتێوەردانیان تێدا کرابێت.

هەروەها بە پێچەوانەی شوێنەواری کۆنەوە کە بە بۆچوون و گومان و تەخمین و لێکدانەوە بۆیان دەڕوانرێت و کاریان بۆ دەکرێت.

دەبێ لەڕووی بایەخی ئەم جۆرە سەرچاوەوە لە عاستی سەرچاوەکانی دیکەی مێژوودا بگوترێت: ئەم بەڵگەنامە و سەنەدانە هەر ئەوە نییە بۆ

ناسـاندن و دۆزینـەوەی مێـژووی گۆڕانكـاریی كۆمەڵایـەتی و ئـابووری و سیاسـی و فەرهـەنگی و نیزامـی دەژمێـردرێن، بـەڵكو چـونكە ئـەنجامی كاردانـەوەی ئیـدارین و لـە بـارەی ڕەفتـاری ڕۆژانـەی كەسـانی كۆمـەڵگاوە بـوون و، بـۆ پاراسـتنی پێوەنـدی كۆمـەڵگا بـە دەسـتگاكانی ئیـداری و فەرمییـەوە ئامـادە كـراون، دوورن لـە درۆ و خۆنوانـدن و، مەبەسـتی تایبـەتی. جـا بـە بۆنـەی ئـەو بایـەخ و جێگـەی متمانەییـەی لـە ڕووی ڕەسـەنی و تۆمـاركردنی ڕووداوەكانـەوە هەیانـە، لـە كۆنـەوە، تەنانـەت لـە كۆمەڵگا كۆنەكانیشدا، ناسراو و پڕ بایەخ بوون. لەبـەر ئەمـە و بـە سـوود وەرگرتن لەم جۆرە بەڵگەنامانە دەكرێ پـەی بـە هەڵـە و، پەردەپۆشـی و، چاو و ڕاوكردن و، چەواشەكاری و، شێواندنی خواستی هەندێك لە مێـژوو نووسـانی كـۆن ببرێـت، وەك دەكـرێ لـە ڕێگـەی ئـەو بەڵگەنامانـەوە گـەلێ ڕووی تایبـەتی و نـەزانراوی مێـژووی كـۆن بـە لێكدانـەوە و لێكۆڵینـەوەی ئەو بەڵگەنامانە بە دەست بێت.

لـەم ڕووەوە دەتـوانرێ بگوترێـت: لـەناو هـەموو سـامانی نەتەوەییـدا بەڵگەنامـــەی نەتـــەوەیی و مێـــژوویی و ئەرشـــیفیی بـــە بایـــەختر و گرانبـەهاتریانن. چـونكە ئـەو بەڵگەنامانـە ئـەنجامی زانـست و ئـەزموونی پێـشینانمانن و، لـە ڕاسـتیدا دیـاریی چـینەكانی پێـشوون بـۆ نـەوەكانی ئەمڕۆ. بۆیـە ئێمـە چـەند بایـەخ بـە ئەرشـیف و پاشماوەكانمـان بـدەین و چـاوەدێرییان بكـەین ئەوەنـدە نیـشانەی ئەوەیـە كـە چـەند لـە مێـژووی شارسـتانیەت و فەرهـەنگی خۆمـان ئاشـناین و زانـست و ژیـری و دانـایی زیـاتر دەزانـین و، پـەی بـە پلـەی زانایـان و ڕۆشـنبیران و دانـشمەندانمان دەبـــەین و، لـــەژیانی ڕۆژانەمانـــدا لـــە ئـــەزموونی پێـــشینانمان زیـــاتر بەهرەمەنـد دەبـین و، هەڵـەكانی ئـەوان دووبـارە ناكەینـەوە و، كۆمەڵگـە، بەتایبەتی گەنجان، لە فەرهەنگی پێشینان دانابڕێن و ئەنجام، چ لە كۆنـدا چ ئێـستە، پلـەی ژیـری و ئاگـایی گـەلان و دەوڵەمەنـدیی فەرهـەنگیان لـە

رووی بایەخـــدانی دەوڵەتانـــەوە بـــەم جـــۆرە دەســـگا و ناوەندانـــە دەنرخێنرێت و هەڵدەسەنگێنرێت.

خۆشبەختانە لەم ساڵانەی دواییدا بایەخدان بـە مێـژوو و شارسـتانیەت و ئەرشـیف و بەڵگەنامـە لـە کۆمەڵگـەی ئێمـەدا ڕەنـگ و ڕوویـەکی باشـی بەخۆیــەوە دیــوە و، ڕۆژانــە شــایەتی فراوانکردنــی زانــستی ئەرشــیف و بایەخدان بە بەڵگەنامەی نەتەوەیی و مێـژوویی لـە کۆمەڵگاکەمانـداین و، ئەمساڵیش بە کردنەوەی ڕەسمیی تەلاری (گەنجینەی ئەسـنادی نەتـەوەیی ئێران) شایەتی ئەوپـەڕی بایەخـدانی دەوڵـەت بـەم کـارە گـەورە بـووین و، ئینشائەڵڵا زۆریشی پێناچێت کە شـایەتی پرشـنگدانەوەی نیـشانەی زیـاتر بە سنگی گەلی ئێرانەوە دەبین"[٢].

لـە دوای کردنــەوەی ئــەم دەرگایــەوە دێمــە ســەر ئــەوە بڵـێم: ئێمــەی کـوردیش - وەك هـەموو گـەلانی جیهـان - خـاوەنی سـامانی نەتـەوەیی و کولتـووریی خۆمـانین و، سـەدان و هـەزاران بەڵگەنامـەمان هەیـە شـیاوی ئــەوەن، پــێش هــەموو شــتێك بــاش بیانپــارێزین و لــە ترســی مەترســی لەناوچوون و لەناوبردن ڕزگاریان بکـەین و، دوای ئـەوە بـە بەرنامـە و لـە ڕێگەی کەسانی کارامـە و شـارەزا و بەچـاولێکردن و پـەیڕەویکردنی کـاری گـەلانی جیهانــەوە، هـەنگاوی ورد و لەسـەرخۆ بنـێین بـۆ بڵاوکردنــەوە و بووژاندنەوەی ئەو بەڵگەنامانە و، فەرهـەنگ و سـامانی کولتووریمانیـان پـێ دەوڵەمەند بکەین و، وەك گەلانی خواپێداوی جیهان ئێمەیش لە سایەیاندا بەهرەمەند ببین و پەندیان لێ وەربگرین.

لەم هەلەدا بەڵگەنامەیەکی گـەورە دەسـتەڵاتدارێکی کـورد کـە ماوەیـەك لـە کوردسـتانی ئـەودیودا - سـنە و دەوروبـەری - فـەرمانڕەواو بـەرپرس و فەرمانــدە بــووە، دەکــەم بــە کەرەســەی ئــەم بابەتــە، بــەهیوای ئــەوەی کردنـــەوەی دەرگایـــەك بێـــت لـــەم لایەنـــە فەرامۆشـــکراوەی ســـامانی نەتەوایەتیمان و، هاندەرێك بێت بۆ ئەوەی ئێمەش بەخۆماندا بچینەوە و

لاسایی گەلانی جیهان بکەینەوە و - با درەنگیش بێت - نەختێك بەخۆکەوین و بەرگری لە بەزایەچوونی ئەو سامانە پڕبایەخە بکەین.

لەم بوارەدا لە ئەرشیفی تایبەتی خۆمدا چەندین بەلگەنامەی بە بایەخم - هەندێکیان وەك خۆی و بە ئەسڵی و هەندێکیان بە وێنە - کۆ کردووەتەوە و پاراستوومن و، ناو بەناو لە چەند گۆڤار و شوێندا لێیانم بلاو کردوەتەوە(٣)، لێرەیشدا هەنگاوێکی دیکە لەسەر ئەو ڕێگە دەنێم و، زنجیرەیەك بەلگەنامە - بە یارمەتی خودا - دەخەمە پاڵ بەلگەنامە بلاوکراوەکانی پێشوو.

## بەلگەنامەی یەکەم

بۆ ئەم زنجیرە بەلگەنامە یەکەمیان بەلگەنامەیەکم هەڵبژارد کە بە فەرمانی عەلی ئەکبەرخانی (شرف الملك)ی جێگری حکوومەتی کوردستان - سنە - نووسراوەتەوە و، وەك لەمەولا دەردەکەوێت بایەخی تایبەتی خۆی هەیە.

عەلی ئەکبەرخان کێیە؟

لەو سەرچاوانەی لە بەر دەستمدان دوو سەرچاوە هەیە کە گومانی ئەوەیان بۆ بچێت باسی ئەم پیاوەیان تێدا بێت.

یەکەمیان: (لغت نامەء دهخدا) کە بەداخەوە ناوی چەندین (شرف الملك) و (علی اکبر)ی تێدایە ناوی ئەو عەلی ئەکبەرخانەی کوردی تێدا نییە.

دووەمیان: (تأریخ مردوخ)ی ئایەتوڵلای مەردۆخی کوردستانییە، ئەمیش دووبارە - بەداخەوە - (١٣) جار لە کارەسات و ڕووداوی جۆراوجۆردا ناوی عەلی ئەکبەرخانی هێناوە، بەلأم جارێکیش چییە بەلای مێژووی ژیانیدا نەچووە، لەیەك شوێندا لە ڕووداوێکدا کە لە ڕۆژی حەوتی (جمادي الثانية)ی ساڵی ١٣٣٠دا بووە - دیاری نەکردووە هەتاوی یان مانگییە - عەلی ئەکبەرخان و کوڕەکەی کوژراون. لە چەند جێگەی پەراگەندەی دیدا دەردەکەوێت کە عەلی ئەکبەرخان ساڵی ١٢٩١ لە کوردستان سنە بووە و، ساڵی ١٣٠٠ لە فەرمانڕەوایی ئەردەبیل لاچووە و،

ساڵی ١٣٠٣ له سنه کاردار بووه و، ساڵی ١٣٠٤ له ئەصفەهان بووه و، ساڵی ١٣١١ کاروباری شارۆچکەی بانەی ڕێکخستۆتەوه(٤).

ئەم عەلی ئەکبەرخانی (شرف الملك)ە، کە بە عەلی ئەکبەرخانی یەکەم و (نایب الحکومة) ناسراوه، کوڕی محەمەد صادق خانی ئەردەڵان بووه. محەمەد صادق خان حەوت کوڕی بووه:

١- محەمەد جەعفەرخان.
٢- محەمەد ڕەزاخان.
٣- عەلی ئەکبەر خان (شرف الملك)ی یەکەم (نایب الحکومة).
٤- مووسا خان.
٥- لوطفوڵڵا خان.
٦- شێخ فەرجوڵڵا خان.
٧- محەمەد سەلیم خان.

عەلی ئەکبەرخانیش حەوت کوڕی هەبووه کە ئەمانەن:

١- سلێمان خان (شرف الملك)ی دووەم. خەتخۆش بووه.
٢- عەلی ئەوسەط خان
٣- عەلی خان (خانی یەکەم).
٤- ئەحمەد خان (شرف الدولة)
٥- مەحموود خان (صغیر).
٦- ئەعظەم خان.
٧- عەلی ئەعلا خان(٥).

چەند سوودێکی بەڵگەنامە:

یەکەم: گەڵێ جار وا دەبێت ناوی گوند و مەزرا و چیا و کەند و دۆڵ گۆڕانی بەسەردا دێت، بەڵگەنامە ناوی کۆنی ئەو شوێنانەی لە سەردەمی نووسرانی بەڵگەنامەکەدا چۆن گوتراون تێدا پارێزراوه، جاری وا هەبووه گوندێك هەر لە بەین براوه یان تێدا چووه، کەچی لە بەڵگەنامەدا ناوی پارێزراوه.

دووەم: لەڕووی چەند بەڵگەنامەوە کە لە سەردەمی جیاجیادا نووسرابن شەقڵ و شێوەی جۆراوجۆری نووسینی بەڵگەنامە دەزانرێت و، دەزانین بە چ خەت و کاغەز و مەرەکەبێك نووسراون و، زمانی نووسینی ئەو سەردەمە چۆن بووە.

سێیەم: لێرەدا خۆم وەك واعیظ و وتاربێژ دانانێم و، وتارەکەم سەرکۆ و بڵندگۆی مزگەوت نییە، بەڵام بیرخستنەوەی هەندێك ڕەفتاری چەوت و هەڵەی مێژوویی کە لە هەموو سەردەمێکدا هەندێ دەسەڵاتدار و کاربەدەستی تێدەکەوێت، بێسوود نییە، بەڵکو ئەمە یەکێکە لەو سوودانەی لە ڕوانگەی مێژووەوە لەو دەقانەوە دەخوێنرێتەوە و لێیان وەردەگیرێت.

### ئەو بابەتانەی ئەم بەڵگەنامەی بۆ نووسراوە چین؟

ئەم بەڵگەنامە بۆ کڕینی گوند و زەوی و زار و ئاش و جۆگە و شتی وا نووسراوە، کە ژمارەیان لە حەفتا تێدەپەڕێ. دەبێ جگە لەمانەیش کڕیاری ئەو زەوی و زارانە کە عەلی ئەکبەرخانی (شرف الملك) بووە، چەند فەرشی نایاب و خانوو و تەلاری دی کڕیبێ؟ دەبێ چەند شتی دیکەی ناوماڵی هەبووبێ؟ دەبێ چەند ئاژەڵ و گا و گۆتاڵ و ماین و ئەسپی ڕەسەنی هەبووبێ؟ دوای ئەمانیش دەپرسین: دەبێ چەند کۆڕ و کۆمەڵی گرتبێ تا ئەو هەموو مامۆستا و زانا و پیاو ماقووڵ و کاسبکارانەی کۆ کردبێتەوە تا بیانکات بە شایەت بەسەر زەوی و زار و سامانەکەیەوە؟ جا دوای ئەمانەیش و ئەوانەیش دێمە سەر پرسیاری جێگەی مەبەست و دەڵێم: دەبێ ئەم پیاوە کەی کاتی ئەوەی هەبووبێت بیر لە ڕەعییەت و ڕەشە خەڵك بکاتەوە و بە کاروباریاندا ڕابگات؟ دەبێ چی لەگەڵیاندا کردبێت؟ ئەگەر ئەوەندەی مەبەستی بووە زەوی و زار و جۆگە و ئاش بەیەکەوە بنێت ئەوەندەیش ڕەعییەتی مەبەست بووایەت ئەڵبەت ئێستە لەسەر لاپەڕەکانی مێژوو چەند کاری دیار و شایستەی بۆ تۆمار دەکرا.

ئەم پرسیار و بیرخستنەوانەم بۆ ئەوەیە بڵێم: ئەو زەوی و زار و باخ و داخە دوای (شرف الملك) چییان بەسەرهات؟ دیارە وەك مامۆستایەکی ژێر

و خاوەن بیر بە میرێکی فەرموو: ئەگەر بۆ کەس بمایەن نەگەیشتنە دەست تۆ! ئەمیش بۆی نەماونەتەوە و کەوتوونەتە دەست کەسانی دی و، دوای ئەو چەند دەستی دییان دیوە!

دوای ئەمانە دێمە سەر مەبەست لەسەر ئەم باسە کورتە و وەك لە پێشەکیی (گەنجینەی ئەسناد)یشدا بوو یەکێك لە سوودەکانی بەڵگەنامەکانی کۆنمان ئەوەیە کە ئەگەر پێشینانمان هەڵەیەکیان کردبێت ئێمە تێی نەکەوینەوە، هەڵەیش لەوە گەورەتر کامەیە کە یەکێك کارێکی کەوتە دەست و، بەرپرسیارییەکی نرایە ئەستۆ پێش هەموو شت بیر لە کۆکردنەوەی سەروت و سامان بۆ خۆی بکاتەوە و، هەوڵ بدات خۆی و خزم و کەس و کاری دەوڵەمەند بکات و بیانگەیەنێتە پلە و پایە؟ دیارە ئەمە خواست و ئارەزووی کەسانێکە کە بە هەڵە لە دنیا و بەرپرسیارێتی گەیشتوون و، ئەوەیان لەبیر دەچێتەوە کە هیچی لەگەڵ خۆیان نابەن و، دوای خۆیان دابەش دەکرێن و بۆ کەسانی دی دەچن و ئەمیش ناوی باشەی بۆ نامێنێتەوە! بەڵکو ژیر ئەو کەسەیە هەوڵی ئەوە بدات ـ لەباتی کۆشك و تەلار و سامان ـ نەمریی بۆ خۆی بهێڵێتەوە، کە ئەویش تەنها لە ناوی باش و کردەوەی چاکدایە کە بە خزمەتی شیاو و دروستی هاونیشتیمان و کەسانێ دێتە دی کە ئەو لە ژیانیدا لێیان بەرپرس و بەرپرسیار بووە.

سوودێکی دیکەی بەڵگەنامە لەوەدایە لە کۆتایی و پەراوێزی بەڵگەنامەکاندا ناوی چەندین زانا و کەسایەتی گەورە و ناودار و ناسراو نووسراوە، کاتی واش هەیە ناوی کەسانێك نووسراوە لە سەرچاوەکاندا باسیان نییە، یان ئەگەر ناویان هەبێت لە سنوورێکی تەسکدایە و، زانیاری لەسەر قۆناغەکانی ژیانیان و ئەو کاروبارانەی لە ئەستۆیاندا بووە و، ئەو ئەرکانەی لەسەر شانیان بووە و ئەنجامیان داون، لە دەستدا نییە، بەڵام دەبینین لە پەراوێزی بەڵگەنامەیەکدا ناوی هاتووە و بەڵگەنامەکە مێژووی پێوەیە، بەوە دەزانین کە ئەو کەسە لەو مێژووەدا لە ژیاندا بووە، لە بەڵگەنامەیەکی دیدا دیسان ناوی هاتووە و باسی ئەوە کراوە مامۆستای

فلاَن گوند یان شارۆچکه بووه، یان قازیی یان موفتی شوێنێك بووه، لەمەیشەوە شتێکی دی لە مێژووی ژیانی دەدۆزرێتەوە، جا تا چەند ئەو بەڵگەنامانە زۆر بن و بۆ قۆناغگەلی جیاجیا بگەڕێنەوە، ئەوەندە مێژوومان دەوڵەمەندتر دەکەن و سوودی زیاتریان بۆ دۆزینەوەی قۆناغەکانی مێژووی ژیانی زانایان و ناودارمان دەبێت.

**چەند سەرنجێك لەبارەی ئەم دەقانەوە:**

**یەکەم**: نازانم و دیار نییە دەقەکان کێ دایڕشتوون، دیارە پیاوی زانا و پەخشان نووسی شارەزای ئەو سەردەمەیان بۆ ئەم مەبەستە هەڵبژاردووە. بە زۆری دەقی بەڵگەنامەکانی کۆن بەم شێوەن.

**دووەم**: نووسەرەوەکانیشیان کە دیارە لە خۆشنووسانی ئەو سەردەمە بوون، وەك داڕێژەری دەقەکان، زانراو نین. دەبێ ئەوە بڵێم: دەگونجێ نووسەر و داڕێژەرەکەی یەك کەس بووبێت، وەك دەگونجێ دوو کەس بووبن.

**سێیەم**: نووسینەکان تێکەڵاو و شکستە و لە هەندێ جێگەدا بێ نوختە یان کەم نوختەن و، ئەمەیش کاری خوێندنەوەیانی گران کردووە.

**چوارەم**: نووسینەکان پوخت و ساف و بێ هەڵەن، ئەگەر کەم ـ کەم هەڵە لە هەندێکیاندا هەبێت ڕاستی ناکەمەوە و وەك خۆی دەینووسم.

بۆ نموونە لە هەندێك جێگەدا نووسراوە (بسم الله وخیر الاسماء).

**پێنجەم**: لە دەقەکاندا فارسی و عەرەبی تێکەڵ کراوە و جاری وا هەیە وای لێدێت وەك ئەوە وایە دەقەکە عەرەبی بێت.

**شەشەم**: زۆری بەرمۆرەکان ـ ئەو دەقانەی لەپێش مۆرەکانەوە نووسراون ـ وەك یەك وان یان لە یەکەوە نزیکن، بەڵام لەبەر ئەوەی مەبەستی سەرەکیی من لە نووسینیان ناوی نووسەرەوەکانیانە دەقەکانیش دەنووسم.

**حەوتــەم:** خــەتی بــەرمۆرەكان بــەزۆری خۆشــن و خەتــەكانیان خۆشــە، ئەگــەر خــەتی خــاوەن مۆرەكــان بێــت دیــارە هــەموویان خــەتخۆش بــوون، دەشگونجێ هەندێكیان كەسانی دی نووسیبنیان.

**هەشتەم:** زۆربەی خـاوەن مۆرەكـان تـەنها نـاوی خۆیـان ـ یـان شـتێك كـە ئاماژە بێت بۆ ناویان ـ یان نووسیوە، دیارە ئەو كاتـە ناسـراو بـوون، بـەڵام ئێستە نایانناسـین. جگـە لەمـە واشـدەبێت یـەك نـاو ـ محەمـەد، یـان مـەلا عەبدوڕەحمان... یان ـ لە بەڵگەنامەیەكدا چەند پات دەبێتەوە، خۆ ئەگەر بـە هـەر زەحمـەتێك مـەلا عەبـدوڕەحمانێكیان بناسـین، ئـەوا لـەناو ئـەو چەند ناوەدا پەی بە كەسایەتیی هەموویان نابەین.

**نۆیـەم:** ئـەوەی لـەدوای بەرمۆرەكانـەوە لـەناو دوو كەوانـەدا نووسـیومە ئـەوە نووسـراوی نـاو مۆرەكانـە، واتـە نـاوی یـەكێك لـە شـایەتەكانی نـاو بەڵگەنامەكەیە كە كراوە بە شایەت لەسەر ئەو مامەڵە.

**دەیـەم:** هـەر مـۆرێكیش كـە بـۆم نەخوێنرایـەوە لـەناو دوو كەوانەكـەدا چەند خاڵ دادەنێم، تا بزانرێت بۆم ساغ نەكراوەتەوە.

### ناوەرۆكی بەڵگەنامەكان

ئــەم بەڵگەنامانــە بــە زمــانێكی فارســیی تێكــەڵكراو لــە عــەرەبی و بەشێوەیەكی پڕ لە زاراوەی پەسـن و سـتایش و پیاهەڵدانی لـە ڕادەبـەدەر موبالـەغاوی وا نووسـراون كـە ئەگـەر بێـت و تەرجەمـە بكـرێن هـەر زۆر زۆریان دەوێت و، زیادیش نەڕۆیشتووم ئەگەر بڵێم: لـە توانـادا نییـە وەك خۆیان تەرجەمە بكرێن. خۆ ئەگەر لـە توانایـشدا بێـت تەرجەمـە بكـرێن بەو دەقەی خۆیان سوودێكی ئـەوتۆ بـە ڕەوشـی ڕۆشـنبیری ئـەمڕۆ نـادەن، بەڵكو ئەوەی بۆ ئەمڕۆ پێویستە ئەوەیە ناوەرۆكی ئەو دەقانە بزانـرێت و، لە هەمان كاتیشدا ئەوە بزانرێت لـەو سـەردەمەدا چ جـۆرە ئینـشا و ڕێ و ڕەسمێك بۆ نووسینی بەڵگەی موڵكایەتی و قەباڵەجات بەكارهێنراوە.

بۆیە من لێرەدا ـ کە دەقەکان بە کوردی نین ـ پوختـەی ناوەرۆکـەکانیان و ئەوانـەی لێیـان وەردەگیرێـت دەکـەم بـە کـوردی. تـا خوێنـەری کـورد ئاگاداری ئەو ناوەرۆکـە بێـت، کـە وادەزانم لەوەشـی زیـاتر بـەلاوە جێگـەی بایەخ نییە.

**بەڵگەنامەی یەکەم:**

لەبـەر ئـەوەی عـەلی ئەکبـەرخان (شـەرەفولولك) جێگـری حکوومـەتی کوردسـتان، زەوی و زار و دووکـان و بـازاڕ و کۆشـك و تـەلارێکی زۆری لـە ناوچەی کوردستان بەشێوەی شەرعیی بەدەست هێناوە و، بۆ هـەر یـەکێك لـەو زەوی و زار و ماڵانـە یـەك دانـە سـەنەد و بەڵگـەی موڵکایـەتی لەدەستدایە و، ئەو بەڵگە و قەباڵانـەیش زۆرن و لەوانەیـە لێیـان بـدزرێت یان لەناو بچێت.. داوای لە پیاوانی شەرع کرد کە نـاوەرۆکی یەکـە یەکـەی ئەو قەباڵانە بە کورتی لە یـەك فیهرەسـتی سـەربەخۆدا کـۆ بکەنـەوە، کـە ئەگەر یەکێك لە قەباڵـەکان لەناوچوو ئـەو فیهرەسـتە درێـژە جێگـرەوەی ئەو لەناوچووە بێت و، بەڵگەی موڵکایەتییەکە بێت. لەسەر داوای نـاوبراو کورتەیەك لە درێژەی ناوەرۆکی قەباڵەکان جیاجیـا لێـرەدا نووسـرا تـا بـۆ ڕۆژگار بەڵگەی بەهێز و سەنەدی شەرعیی موڵکایەتیی ئەو موڵکانە بن.

دوای ئەمـە کاغـەزێکی پـان و درێـژ بـە پێوانـەی (۳۰ × ۳۰۰)[٦] بـە مەرەکەبی تەلایی جۆگەلە ـ جۆگەلە کراوە و لە زیاد لە حەفتا جێگەیاندا نـاوی زەوی و بـاخ و ئـاش و خـانوو و شـتی دی نووسـراوە کـە عـەلی ئەکبەرخانی شەرەفولولك کڕیونی. لەهەر جێگەیەك لەو جێگایانەدا ناوی کڕیار و فرۆشیار و شتە فرۆشراوەکە بەوردی دیاری کراوە.

لەو بابەتانە لەبەر زۆرییان و، لەبەر ئەوەیش نووسینەوەی گشتیان نابێ بەهۆی زانیارییەکی تازە و بەسوود بۆ باسـەکەی ئێمـە، وام بـە بـاش زانـی بە دەقەکەی خۆیان و وەك خۆیان نموونەیان لێ وەربگرم و، بـۆ ئەمـەیش

له سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی بابەتەکان سێ ـ سێ.. سێ. نموونـەم لێ وەرگرتن وەك خۆیان روونووسم کردن.

**مۆرەکانی سەر بەڵگەنامەکە**

ئـەم بەڵگەنامـە دوای ئـەوەی بـەو شـێوە بـە خـەتێکی (نـستعلیق)ی زۆر جـوان نووسـراوەتەوە بـە باشـترین مەرەکـەب و کاغـەز و خەتخۆشـترین کەسی ئەو سەردەمە، بەڵگەنامەکە پیشانی زانایـان و قازییـان و موفتییـان و بازرگــان و کاســبکاران و کەســانی دی دراوە، ئــەوانیش بەشــێوەگەلی جیاجیـا، بــە زمانــەکانی فارســی و عــەرەبی، بــە دەقــی درێــژ و کــورت، شــایەتییان لەســەر دروســتیی نــاوەرۆکی بەڵگەنامەکــە داوە و، لــەدوای شایەتییەکانیانەوە مۆری تایبەتی خۆیان داناوە.

ژمارەی ئەو کەسانەی لەسەر ئەو بەڵگەنامە شـایەتییان داوە (٨٢) کەسـن لە ناوداران و زانایان و پیاوماقووڵانی ناوچەکە و دەوروبەری.

بەشـی زۆریـان لـە مۆرەکانیانـدا هـەر نـاوی خۆیـان نووسـیوە، وایـشدەبێ ناوەکەیـشیان بــە دروسـتی نەنووسـیوە، تـەنها ئاماژەیـان لـە مۆرەکـەدا نووسیوە، دیارە ئەوە بۆ ئەو سەردەمە بەس بووە و کەسـەکان کەسـایەتیی نـاودار و ناسـراوی ناوچـەکە بـوون، بـەڵام بـۆ ئێـستە و ئێمـە نەناسـراو و نامۆن و، نازانین کێن و کاتی خۆی چی بوون و چ دەورێکیان گێڕاوە.

هــەروەها زۆر کەمیــشیان لەتــەك مۆرەکــەدا مێــژووی مۆرکردنەکــەیان دیاریی کردووە. ئەمانە ئەگەر وا نەبووایەن سوودیان گەلێ زیاتر دەبوو.

بەهەرحاڵ مـن دەقـی پێـشنووسی پـێش هـەر ٨٢ مۆرەکـەم ـ ئـەوەی بـۆم ساغ بووەتەوە ـ نووسیوە. بـەزۆریش سـاغم کردوونەتـەوە، بـەڵام گـەلێ لـە مۆرەکان یان باش دەرنەچوون، یان شێوەی نووسینەکەیان پێچ و پلووچـە و بـۆم نەخوێنراونەتـەوە، بـۆ ئـەو شـوێنانە لـەنێو دوو کەوانـەدا خـاڵم داناوە.

## سەرەتای بەڵگەنامەکە و چەند دەقێك

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله العلي الاكبر الأحكم الاعدل في عالم الإمكان، الذي لا يتطرق الى سرادقات قدسه تغيير ولا نقصان، وأعطى ماشاء من الاملاك والقرى والبلدان، من شاء حسب الاستعداد والقابلية والشان، وجعل سيدنا ومقتدانا محمدا علة جامعة ووسيلة ساطعة لايجاد الأكوان، وصيره شرفاً لملك الاسلام والإيمان، ومعدنا ولأمن والأمان، ومنبعا للجود والاحسان، المختار من المختار من عدنان. صلى الله عليه وعلى آله وأصحابه صلاة وسلاما يتبعهما روح وريحان، ويعقبهما مغفرة ورضوان.

وبعد: چون سركار عظمت مدار معدلت كردار، امير الامراء العظام، نتيجة الولاة الفخام، باسط بساط أمن وأمان، قالع آثار جور وطغيان، مقرب الخاقان (علي اكبر خان شرف الملك) نائب الحكومهء كردستان - دام إقباله - املاك مفصله را از: قراء، وعمارات، ورباطات، ودكاكين بازار واقعه در محال كردستان اكتساب شرعي فرموده، وبنجاله وقيد تملك اختصاص خود در آورده بودند، وبراى ملك هر يك قباله وسجل معتبر محكوم به بخطوط وخواتم اهالى شريعت مقدسه در دست داشت، ليكن بعلة تعدد وتكثر قبالجات ممكن بوده كه بعضى از آنها مفقود ويا مسروق گردد، از اهالي شرع مطاع ملتمس وخواهان شد، كه مضمون هر يك ازان قبالجاترا احمالا در ضمن فهرست عليحده جمع نموده، كه اگر فرضا يكى از آنها مفقود ومعدوم شود همان فهرست سند كافى ودليل وافى باشد.

اجابة لملتمسه مجملى از مفصلى هر يك ازان قبالجات را در جداول اين فهرست جدا - جدا ثبت ودرج نموده، تادر روزگار حجت قوى وسند شرعى بر ملكيت املاك مفصله قوى باشد.

نموونه له دهقهكان:

١. چهار دانگ ويك طسوج از قريهء صفى آباد مـن محـال جونـراود از عالى جاهان: محمد جعفر خان، وموسى خان، وفرج الله خان، ومحمـد سـليم خان، ولطفعلى خان. وعلياجاهان: زيبا خانم، وخورشيد لقا خانم، وحـورى لقاخانم، بـردران وخواهران سركار مقرب الخاقان على اكبر خان شرف الملك ـ دام اقبالـه ـ بـصيغ بيـع ونـذر واجـاره ومـصالحهء صحـحيهء شـرعيه در مقابل اخذ وقبض مبلغ چهار صد تومان نقـد رايـج بـسركار عظمـت مـدار علي اكبر خان شـرف الملـك معظـم اليـه انتقـال شـرعى پـــذيرفته. في شـهر شعبان المعظم سنة ١٢٧١.

٢. ايــضا يــك طــسوج وســه ذره از قريـــهء صــفي آبــاد مزبــوره از علياجاهان بگم خان، ملقبـه بخـانم كوچـك، صـبيهء مرحـوم محمـد صـادق خان ـ غفر له ـ سپس بيع ونذر واجاره ومصالحهء شرعيه، در مقابل مبلغ يازده تومان نقد رايج بسركار با اقتدار علي اكبر خـان شـرف الملـك انتقـال شرعى يافتـه، بانـضمام سـهم مـوروثي سـركار شـرف الملـك، وسـهم مـوروثى عاليجـاه محمـد رضـا خـان، كـه بعاليجـاه لطـف علـي خـان بـرادرش سـپس معاوضهء ملكى انتقال يافته. واز و نيز بسركار مقرب الخاقـان شـرف الملـك بجميع صيغ ناقلهء شرعيه منتقل گرديده. ششدانـگ قريـهء مزبـوره ملـك حق وحق طلق سركار معظم اليه ميباشد.

٣. شـشدانگ دو دسـت عمـارات ابتيـاعى، از عاليحـضرت خـير الحـاج حـاجى اسـد الله تـاجر همـدانى، از سـركار جلالتمـدار، فخـر الـولاة العظـام، مقرب الخاقان، امان الله خـان والى ـ دام اقبالـه ـ بطريـق هبـه ونـذر شـرعى بسركار على اكبر خان شرف الملك انتقال شرعى يافته في شهر صـفر المظفـر ١٢٧١.

مخفى نمانـد كـه خانهاى مرقومـه الآن درجاى آنهـا كاروانـسراى احـداثى سركار مقرب الخاقان شرف الملك ـ دام اقباله ـ ساخته وبنا شده است.

***

۳۰ـ [۷] سه دانگ از قریهء گزنه و سه دانگ از قریهء گندمان من محال حسن آباد، بعد از وضع چند قطعة املاك ورثهء مرحوم ملا سليم، در قريهء گندمان از عاليجاه ميرزا آقای تاجر كاشاني ناظم التجار كردستان، در مقابل اخذ وقبض مبلغ يكهزارو ششصد تومان نقد رايج، بسركار مقرب الخاقان خان شرف الملك انتقال شرعى پـذير فته في شهر ذى حجة الحرام سنه ١٢٨٦.

٣١ـ دو دانگ از قريهء ناوگران، من محال ئيلاق، از عاليجاه زين العابدين سلطان توبخانهء مباركه، بصيغ بيع ونذر واجاره وصلح شرعى، در مقابل اخذ وقبض يكصدو ده تومان نقد رايج بسركار معظم اليه انتقال شرعى يافته. في شهر ذي حجة الحرام سنه ١٢٨٦.

٣٢ـ ششدانگ قريهء على آباد، واقعه در محال ئيلاق، از عاليجاه ميرزا مهدى قلى، خلف مرحوم ميرزا الله قلى، بطريق مبايعه ومواجره و مناذره و مصالحهء شرعيه، در مقابل مبلغ يكهزار تومان نقد رايج مأخوذ ومقبوض، بسركار با عز وقارخان شرف الملك ـ دام مجده ـ انتقال شرعى پـذيرفته. في شهر ذي حجة الحرام سنه ١٢٨٦.

٦٨ـ دو دانگ از قريهء ولير، من محال ژاورود، از جنابان ملا عبدالرزاق، وملا محمد باقر، خلفان مرحوم مبرور ملا احمد شيخ الاسلام، بجميع صيغ ناقلهء شرعيه از: بيع ونذر واجاره ومصالحهء شرعيه... در مقابل مبلغ يكصد وپنجاه تومان نقد رايج مأخوذ ومقبوض بسركار مقرب الخاقان شرف الملك انتقال شرعى يافته، في شهر رمضان المبارك سنه ١٢٩٢.

٦٩ـ ششدانگ مالكى قريهء نورهء عليا وسفلى، از جناب مستطاب ملا لطف الله شيخ الاسلام بجميع صيغ ناقلهء شرعيه من: البيع والنذر والاجارة والمصالحه، در مقابل مبلغ دو هزار و پانصد تومان نقد رايج مأخوذ ومقبوض بسركار شوكت مدار مقرب الخاقان شرف الملك معظم اليه انتقال شرعى پـذيرفته. في شهر ذي قعدة الحرام سنه ١٢٩٢.

۷۰. چهار دانگ مفرز از قریهء کرسی، از جناب مستطاب ملا لطف الله شیخ الاسلام بجمیع صیغ ناقلهء شرعیه از: مبایعه ومواجره ومناذره ومصالحهء شرعیه، در مقابل اخذ وقبض مبلغ سه هزار تومان نقد رایج، بسرکار شوکت مدار مقرب الخاقان علی اکبر خان شرف الملك ـ دام اقباله العالی ـ انتقال شرعی یافته. في شهر ذي قعدة الحرام سنه ۱۲۹۲.

## مۆرەکانی سەر بەڵگەنامەکە

۱ـ کتاب مرقوم یشهده المقربون. اقل عباد الله (ابن مرتضی عبدالکریم قلی)

* * *

۲ـ فهرست قبالجات املاك سرکار شوکت مدار بندگانعالی ـ دام مجده ـ مطابق باصل قبالجات معتبره صحیح است. خلف مرحوم محمد سعید بگ (یا موسی)[۸].

* * *

۳ـ فهرست قبالجات املاك سرکار شوکت شعار بندگان خداوند کار عالی شرف الملك ـ دام مجده العالی ـ مطابق باصل قبالجات صحیح است. الحقیر خلف مرحوم ملا عبدالله جوانرودی (الراجي فرج الله)[۹].

* * *

٤ـ فهرست قبالجات املاك سرکار شوکت مدار بندگانعالی ـ دام اقباله ـ مطابق باصل قبالجات صحیح است. اقل اخلق الله (یا اسماعیل) داروغه.

* * *

۵ـ فهرست قبالجات املاك مقرب الخاقان علی اکبر خان شرف الملك، ونائب الحکومهء کردستان بقرارایست که در این ورقه ثبت شده، وجنابان عظام علمای فخام ـ سلمه الله تعالی ـ وسایر اعیان واشراف وکسبه مزین فرمودند صحیح است. في ۲۱ شهر ذی الحجة الحرام ۱۲۹۲ (...........).

* * *

٦ـفهرست املاك سركار با فر وقار، عظمت مدار، كثير الاقتدار، امير الامراء العظام، نتيجة الولاة الفخام، مقرب الخاقان، (شرف الملك) نائب الحكومهء ولايت كردستان ـ دام اجلاله العالى ـ مطابق وموافق اصل قبالجات معتبرهء ممهور بمهر اهالي شرع مطاع، صحيح وبيان واقع است، خدواند مبارك كند ان شاء الله. الحقير (فتح الله).

★ ★ ★

٧ـفهرست قبالجات املاك سركار مدار بندگانعالى ـ دام مجده ـ مطابق باصل قبالجات صحيح است. اقل الحاج (عبده الحسنى) بزاز سنندجى.

★ ★ ★

٨ـ فهرست قبالجات املاك سركار شوكت مدار، بندگان عالى ـ دام اجلاله ـ مطابق باصل قبالجات صحيح است، خداوند مبارك كند ان شاء الله تعالى (محمد صالح) ابن مرحوم حاجي فتح الله.

★ ★ ★

٩ـ فهرست قبالجات املاك سركار شوكتمدار بندگان عالى ـ دام اجلاله ـ مطابق باصل قبالجات وصحيح ومعتبر است، در بيع وشرائي اكثر آنها اطلاع كامل دارم، خداوند مبارك كند، ان شاء الله تعالى. حرره اقل العباد (عبده فيض الله) ابن مرحوم ميرزا حسين كردستانى.

★ ★ ★

١٠ـ فهرست قبالجات املاك سركار شوكتمند، بنگان عالى ـ دام اجلاله ـ مطابق باصل قبالجات صحيح است، در بيع وشرائى اطلاع كامل دارم. خداوند مبارك كند ان شاء الله. حرره اقل الحاج ابن مرحوم اقا مصطفى (شيخ نصرالدين).

★ ★ ★

١١ـ فهرست قبالجات املاك سركار شوكت مدار، بندگان عالى ـ دام اجلاله ـ مطابق باصل قبالجات صحيح است. از بيع وشرائى اغلب املاك اطلاع كامل دارم، ان شاء الله مبارك است.

حرره حبيب الله ابن حاجى ميرزا حسين. (حبيب الله).

★ ★ ★

١٢ـ فهرست قبالجات سركار شوكت مدارخان ـ دام اجلاله ـ مطابق باصل قبالجات معتبره صحيح است (عبده الراجى على).

★ ★ ★

١٣ـ فهرست املاك سركار شوكت مدار مقرب الخاقان مجده! اعيان شرف الملك ـ دام اجلاله العالى ـ مطابق قبالجات معتبره صحيح است. اقل حاج (اللهم صلي على محمد وآل محمد) بزاز كردستانى.

★ ★ ★

١٤ـ فهرست صكوك وقبالجات املاك بندگان سركار، شوكتمدار، عظمت آثار، كثير الاقتدار، مقرب الخاقان، ومؤتمن السلطان، خدايگان خان شرف الملك ـ دام اقباله العالى ـ باصل قباله ونويشتجات معتبره مطابق وبيان واقع است. ريب وتزويرى ندارد. ان شاء الله مسعود ومبارك است. الحقير (بىّ مؤر و ناو).

★ ★ ★

١٥ـ فهرست املاك سركار، شوكت مدار، كثير الاقتدار، با عز وقار، مقرب الخاقان، مؤتمن السلطان، امير الامراء العظام، ونتيجة الولاة الفخام، شرف الملك ـ دام اقباله ـ طبق بااصل قبالجات است وصحيح است. الحقير ابن مرحوم (الله ويردى) ميرزا اسماعيل.

★ ★ ★

١٦ـ فهرست قبالجات املاك سركار شوكتمدار، بندگان عالى ـ دام اجلاله ـ مطابق باصل قبالجات وصحيح ومعتبر است. در بيع وشراى اكثر آنها اطلاع كامل داريم، خداوند مبارك كند ان شاء الله تعالى. حرره العبد اقل ابن مرحوم اقا عبدالله كردستانى. (يا حبيب الله)، (... باباخان).

★ ★ ★

١٧ـ فهرست قبالجات املاك سركار، شوكتمدار خان ـ دام اجلاله ـ مطابق باصل قبالجات وصحيح است. اقل الحاج (نصرالله) بزاز كردستانى. أقل الحاج غلام... (عبده محمد شفيع).

★ ★ ★

١٨ـ فهرست املاك سركار، شوكتمدار، كثير الاقتدار، با عزو وقار، مقرب الخاقان، مؤتمن السلطان، امير الامراء العظام، ونتيجة الولاة الفخام، شرف الملك ـ دام اقباله العالى ـ مطابق با اصل قبالجات وصحيح ومعتبر است. الحقير (يا الله المحمود في كل فعاله)[١٠].

★ ★ ★

١٩ـ هو الله تعالى شانه فهرست قبالجات املاك اكتسابى سركار، كثير الاقتدار، عظمت مدار، مقرب الخاقان، بندگان عالى، شرف الملك، نائب الحكومهء كردستان ـ دام اجلاله العالى ـ مطابق باقبالجات سفيرهء اهالى شرع مطاع صحيح وبيان واقع است. خداوند تعالى مبارك كند. اقل الخلق الله (عبده حبيب النبي مصطفى) سنندجى.

★ ★ ★

٢٠ـ هو الله.. فهرست قبالجات املاك اكتسابى سركار كثير الاقتدار ـ، عمدة الاعيان، مقرب الخاقان، شرف الملك ـ دام اجلاله العالى ـ صحيح است. حين بيع وشرائى اكثر از آنها بودم. العبد الاقل ابن مرحوم حاجى حبيب الله همدانى (... اسلام نجف على).

★ ★ ★

٢١ـ بسم الله وخير الاسماء فهرست قبالجات املاك اكتسابى سركار، كثير الاقتدار، عظمت مدار، مقرب الخاقان، بندگان عالى، شرف الملك نائب الحكومهء كردستان ـ دام اجلاله العالى ـ مطابق با قبالجات معتبرهء ممهوره اهالى شرع مطاع صحيح وبيان واقع است. العبد الاحقر (عبدالغفور).

★ ★ ★

٢٢ـ فهرست قبالجات املاك سركار، كثير الاقتدار، عظمت مدار، مقرب الخاقان بندگان عالى، شرف الملك، نائب الحكومهء كردستان ـ دام اجلاله العالى ـ با قبالجات سفير بمهر اهالى شرع مطاع صحيح است. اقل الحاج تاجر اصفهاني. (محمد ........ محمد)[١١].

* * *

٢٣ـ فهرست قبالجات املاك اكتسابى، سركار، كثير الاقتدار، عمدة الاعاظم والاعيان، مقرب الخاقان خان، شرف الملك ـ ادام الله اجلاله العالى ـ صحيح است. در حين بيع وشراى اكثر آنها حضور داشته ام. اقل الحاج ابن مرحوم حاجى محمد حسين شهير بهمدانى (...عبدالله).

* * *

٢٤ـ بنوعى كه در متن مرقوم شده، فهرست قبالهجات سركار بندگان عالى خان، شرف الملك ـ دام اقباله ـ صحيح است. الاقل عباد (يا حبيب الله) ابن مرحوم ميرزا الله ويردى.

* * *

٢٥ـ بسم الله خير الأسماء، وهو المالك الحق بالتحقيق واليقين. فهرست املاك خالص پاك سركار، معدلتمدار، باعز وقار، بندگان عالى، فخر الامراء الفخام، نتيجة الولاة العظام، مقرب الخاقان، شرف الملك ـ دام اقباله العالى ـ بر وفق ومطابق قبالجات معتبرهء صحيحيهء شرعيهء عليحده، صحيح ومعتبر وحق است. بارك الله له بدوام العمر والعزة والشوكة والاقبال والعدل والجود والعظمة والاجلال، بمنه وكرمه. العبد الحقير (عبده محمد على).

* * *

٢٦ـ بسم الله وخير الاسماء

فهرست املاك سركار، كثير الاقتدار، عظمت مدار، بندگان عالى، شرف الملك، نائب الحكومهء كردستان ـ ادام الله اقباله المتعالي ـ مطابق قبالجات

معتبرهء عليحده صحيح وبيان واقع است. العبد الحقير (عبدالخالق بن محمد على).

* * *

٢٧ـ هو الله

هذه الجداول اضلاع لاشكال مستطيلات، بل بنيان وجدران لعمارات مستقيمات، مشتملات على بيوتات مذهبات عاليات سافلات، بنيت وحليت لان تقر فيها عبارات راشقات، كالحور المقصور في الغرف، او كالشمس في بيت الشرف، حاكيات عن سجلات معتبرات ناطقات، بان الاملاك المرقومة فيها، مملوكة ثابتة لمن له ثبت الفضل والكمال، والدولة والشوكة، والاقبال، امير الامراء العظام، سلالة الولاة الفخام، شرف الملك، على اكبر خان، نائب الحكومة بكردستان، لازال متزايدا بتأييدات الملك المنان. وانا العبد المفتقر الى الله الواحد الصمد (يا احمد).

* * *

٢٨ـ فهرست املاك سركار بندگان عالى شرف الملك ـ دام اقباله صحيح است. الداعى (محمد حسين بن محمود) المتوالى.

* * *

٢٩ـ فهرست املاك سركار مقرب الخاقان قبله گاهى، شرف الملك ـ دام اقباله ـ صحيح ومعتبر است. العبد الاقل (عبده الراجي يوسف).

* * *

٣٠ـ فهرست قبالجات املاك سركار، شوكتمدار، نواب مستطاب خان شرف الملك نائب الحكومه ـ ادام اقباله العالى ـ است. وبطورى كه قلمى وبيان شده صحيح وبيان واقع است. حرره الداعى (على بن اسماعيل).

* * *

٣١ـ فهرست قبالجات سركار، عالى خان، شرف الملك ـ دام اقباله ـ صحيح است. العبد الاقل (على محمد)، (وافوض امرى الى الله عبده لطف الله).

* * *

٣٢- فهرست املاكات سركار، عظمت مدار، مقرب الخاقان شرف الملك نائب الحكومهء كردستان - دام اقباله العالى - معتبر وصحيح است. اقل الطلاب (خلف محمد...).

* * *

٣٣- هو الله... فهرست املاكات سركار، مقرب الخاقان، شرف الملك - دام اقباله العالى - صحيح ومعتبر است. (عبده الراجي حسن محمد).

* * *

٣٤- فهرست املاك سركار، عظمت مدار، مقرب الخاقان خان، شرف الملك، نائب الحكومهء كردستان - دام اقباله العالى - كه همگى ممهور بمهر علماى كردستان است وموافق احكام شرع انور است. الاحقر (ان ربى غني كريم).

* * *

٣٥- اين فهرست مجملى است از مفصل قالجات وسجلات ونوشتجات املاك سركار عظمت مدار شوكت مدار مقرب الخاقان خان شرف الملك نائب الحكومهء كردستان - دام اقباله العالى - كه همگى ممهور بمهر علماء اعلام وحكام شرع كردستان است وصحيح است. العبد الحقير الحاج (حبيب الله ابن شكر الله).

* * *

٣٦- فهرست املاكات سركار، بندگان عالى خان شرف الملك - دام اقباله العالى - صحيح ومعتبر است. الحقير (محمد رضا)[١٢].

* * *

٣٧- فهرست املاكات سركار، بندگان عالى، خداوندگارى خان، شرف الملك - دام اقباله - است. الحاج (يا محمد).

* * *

٣٨- فهرست قبالجات وصكوك، خالى از اوهام وشكوك، سركار عظمت مدار، نور نهار ابهت واقبال، نور بهار سطوت واجلال، شرف الملك نائب الحكومه - ادام الله اقباله - است، وآفتاب ما سطر بر مشارق صحت لامع، ومهتاب ما

سفر بر مطالع حقيت لامع است، الداعى له ـ دام عمره ودولته ـ امام الجمعه والخطيب. (عبدالمؤمن)[١٣].

★ ★ ★

٣٩ـ اين فهرست مجملى است از روى قبالجات وسجلات معتبرهء املاك مقرب الخاقان، بندگان عالى، شرف الملك، نائب الحكومهء كردستان ـ دام اقباله - صحيح ومعتبر است ومطابق هريك قبالجات از املاك است. (محمد جعفر)[١٤].

★ ★ ★

٤٠ـ فهرست املاكات، عظمت مدار، كثير الاقتدار، مقرب الخاقان، شرف الملك، نائب الحكومهء كردستان ـ ادام الله تعالى اقباله ـ در نهايت اعتبار وصحت، موافق ومطابق اصل قبالجات است. خداوند عالم مبارك نمايد. خلف مرحوم فتاح سلطان بانهء (.........).

★ ★ ★

٤١ـ اين فهرست مجملى است از مفصل قبالجات وسجلات ونوشتجات املاك سركار، عظمت مدار، كثير الاقتدا، مقرب الخاقان، شرف الملك، نائب الحكومهء كردستان ـ دام اقباله العالى ـ كه همگى آنها ممهور بمهر علماى اعلام وحكام شرع كردستان است، طابق النعل بالنعل. اين فهرست مختصرى ازان مطول ومفصلها است الاحقر (على اكبر بن عبدالله).

★ ★ ★

٤٢ـ فهرست املاكات سركار، عظمت مدار، كثير الاقتدار، مقرب الخاقان، شرف الملك، نائب الحكومهء كردستان ـ ادام تعالى اقباله ـ موافق ومطابق اصل قبالجات معتبره است، ونهايت اعتبار وكمال صحت دارد. خداوند عالم مبارك كند. الاقل (الراجي الى عبده اسد الله).

★ ★ ★

٤٣ـ فهرست املاك بندگان، سركار، عظمت مدار، كثير الاقتدار، مقرب الخاقان، شرف الملك، نائب الحكومه ـ دام اقباله العالى ـ موافق ومطابق اصل

قبالەجات است، كمال صحت واعتبار دارد، خداوند مبارك كند. اقل عباد الله (محمد على).

★ ★ ★

٤٤ـ فهرست املاك بندگان، سركار، عظمت مدار، كثير الاقتدار، مقرب الخاقان، على اكبر خان، شرف الملك، نائب الحكومەء كردستان ـ دام اقباله العالى ـ مطابق اصل قبالجات ميباشد، وكمال اعتبار وصحت دارد. خداوند عالم مبارك فرمايند. الاقل خلف مرحوم ميرزا فتح الله (....... الله).

★ ★ ★

٤٥ـ فهرستا ملاك سركار، مقرب الخاقان، بندگان عالى، شرف الملك، نائب الحكومەء كردستان ـ دام اقباله المتعالى ـ موافق ومطابق اصل قبالەجات معتبرەء محكوم بهاى اهالى شرع مطاع ميباشد.

★ ★ ★

خداوند ان شاء الله تعالى مبارك وميمون فرمايد. ابن مرحوم حاجى عبدالرزاق تاجر كاشانى (ناظم التجار...).

★ ★ ★

٤٦ـ فهرست املاك سركار عالى خان شرف الملك ـ دام اقباله ـ موافق قبالجات اصل صحيح ومعتبر است. الداعى نقيب السادات (ما از بوء محمد گلشن شدى).

★ ★ ★

٤٧ـ فهرست املاك مقرب الخاقان بندگان عالى، على اكبر خان ـ دام اقباله ـ مطابق اصل است. (عبدالغفار بن عبدالكريم).

★ ★ ★

٤٨ـ فهرست املاك مفصله الاسلامى، مطابق اصل قبالەجات معتبرەء ممهورەء جداگانه است، وبخط مهر علماى اعلام وآقايان ذوى احترام، واعزه واشراف سمت تحرير پذيرفته حرره الاقل (عبده الراجي على رضا).

★ ★ ★

٤٩ـ بسم الله خير الاسماء. فهرست قبالهجات واملاكات سركار مقرب الخاقان، على اكبر خان (شرف الملك) نائب الحكومهء كردستان ـ دام اقباله ـ موافق ومطابق است بااصل قبالجات معتبرهء عليحده. (عبده... ابو طالب الحسيني).

★ ★ ★

٥٠ـ مربعات وضعت في كل بيت منها مزارع وساحات، بل قرى وعمارت، اجمل فيها ما فصل في السجلات والصكوك، المبراة عن اعتراء الاوهام والشكوك، بنيت لتأكيد ما اسست من بيان املاك الامير العديم النظير، ولو بالفرض والتصوير، مقرب الخاقان، الخان الجليل الشان، لازال به ذا شرف، وفي حميته ذا كنف. ولكن من بعض آثاره هذا له اثر باق جميل ليوم الحشر مأثور. حرره الداعى الخاطى (عبد الراجى ....... الله).

★ ★ ★

٥١ـ فهرست املاكات سركار بندگان عالى خان، شرف الملك ـ دام اقباله ـ موافق قبالجات صحيح ومعتبر است عندى (يا اسماعيل).

★ ★ ★

٥٢ـ فهرست املاك سركار، عظمت مدار، مقرب الخاقان، شرف الملك ـ دام اجلاله ـ صحيح وموافق قبالجات وسجلات معتبره است. حرره الداعى الجانى. (عبدالمجيد).

★ ★ ★

٥٣ـ فهرست قبالهجات واملاكات سركار، مقرب الخاقان، عظمت مدار، خداوند گار، معظم بندگان عالى، شرف الملك ـ دام اقاله ـ باصل قبالها مطابق وصحيح ومعتبر است. الحقير (عبدالعزيز)[١٥].

★ ★ ★

٥٤ـ اين فهرست قبالجات سركار، كثير الاقتدار، شوكت مدار، مقرب الخاقان، على اكبر خان، شرف الملك، ونائب الحكومهء كردستان ـ دام اجلاله ـ مطابق

قبالجات معتبره على حده است، كه در اقل (السادة كاشاني!) ٢٦ ذي قعدة الحرام ١٢٩٢ (فرج الله ابن الحسيني).

★ ★ ★

٥٥ـ هذا الاجمال مطابق للتفصيل. الداعى (احمد... الحسيني).

٥٦ـ اين فهرست مجملى است از روى قبالجات وسجلات معتبرهء محكوم بهاى اهالى شرع مطاع استخراج واستكتاب شد، وبا قبالجات اصل بطريق اجمال وتفصيل موافق ومطابق است. بهيچوجه مخالف ندارد. الاقل (هو الكريم عبدالكريم وانى).

★ ★ ★

٥٧ـ فهرست املاك سركار، شوكت مدار، مقرب الخاقان، قبله گاهى، على اكبر خان، نائب الحكومه ـ دام اقباله العالى ـ مطابق وموافق باصل قبالجات، ودر نهايت صحت واعتبار است. خداوند مبارك كند. العبد الاقل (لا اله الا الله الملك الحق المبين عبده محمد يوسف)، (محمد صادق)، (على نقى).

★ ★ ★

٥٨ـ فهرست املاك سركار، شوكت مدار، كثير اقتدار، بندگان عالى، على اكبر خان، شرف الملك، ونائب الحكومهء كردستان ـ دام اقباله المتعالى ـ موافق ومطابق صورت قبالجات وسجلات معتبرهء اهالى شريعت غرّ است. في شهر ذيقعدة الحرام ١٢٩٢. (عبده الراجى محمد).

★ ★ ★

٥٩ـ فهرست قبالجات املاك سركار عالى شرف الملك ـ روحى فداه ـ معتبره وصحيح است. العبد الحقير الاقل (حقير محمد صادق فقير).

٦٠ـ اضلاع مربعات قائمة على الخطوط المستقيمة، استقامتها حاكمية بالإجمال عن صحة تفاصيل مضامين ما حرر في خلالها من الاملاك، وانتقالها الى نتيجة الولاة، بل فخرهم عند الثقاة، مقرب الخاقان، شرف الملك، على اكبر خان، النائب لحكومة كردستان ـ حفظة الله عن شر الزمان ـ

وانا الداعى المدرس المحرر لهذا المقال، في شهر ذي قعدة الحرام. سنة ١٢٩٢ (يوسف بن محمد حسن).

★ ★ ★

٦١ـ هذه هي اضلاع المربعات الموضوعة فيها الاملاك المبيعة المكتسبة الواردة على اعيانها ومنافعها الصيغ الشرعية الناقلة وسائرها، حاوية لمجملات مستغرفة لتفاصيلها المعتبرة المنفذة من أولياء الشريعة الغراء، لحضرة سلالة الامراء العظام، وفذلكة الولاة الفخام، مقرب الخاقان، شرف الملك، على اكبر خان، نائب الحكومة بكردستان، لازال مؤيدا بتفضلات الملك المنان، وانا الداعى لدوام الدولة الابدية. المحرر لهذه السطور شهر ذي قعدة الحرام سنة ١٢٩٢ (محمد بن امام الدين)[١٦].

★ ★ ★

٦٢ـ فهرست املاكات سركار، عظمت مدار، مقرب الخاقان، شرف الملك ـ دام اجلاله ـ مطابق قبالجات معتبرهء محكوم بها، وموافق تفاصيل بنجاقات منفذهء شرعيه است والاجمال حاك عن التفصيل، وخال عن التطويل. حرره الداعى (احمد الله على كل حال).

★ ★ ★

٦٣ـ مبايعات صحيحهء شرعية در خدمت حكام شرع مطاع جريان يافته الحقير (محمد ابراهيم)، (يا هادى المضلين)[١٧].

★ ★ ★

٦٤ـ فهرست املاك سركار، مقرب الخاقان، حدايگانى ام، سركار على اكبر خان، شرف الملك، ونائب الحكومه ـ دام اقباله العالى ـ مطابق وموافق با اصل قبالجات صحيح ومعتبر است. اقل خلق الله تاجر سنندجي (شكر الله بن على)

★ ★ ★

٦٥ـ فهرست املاك سركار با عز وقار كثير الاقتدار عظمت مدار امير الامراء العظام، ونتيجة الولاة الفخام، مقرب الخاقان شرف الملك نائب

الحكومـهء ولايـت كردسـتان  ـ دام اقبالـه العـالى  ـ مطـابق وموافـق بـا اصـل قبالجات وصحيح ومعتـبر اسـت. حـرره الحقـير (حبيـب الله ابـن اسماعيـل). (عبده احمد بن طالب الحسينى).

★ ★ ★

٦٦ـ فهرسـت امـلاك سـركار، عظمـت مـدار، مقـرب الخاقـان، علـى اكـبر خـان شـرف الملـك، ونائـب الحكومـهء كردسـتان صـحيح وموافـق قبالجـات معتـبره است. الاقل ١٢٩٢ (ابو طالب بن محمد الحسينى).

★ ★ ★

٦٧ـ هـذه الاضـلاع المربعـات المـستقيمة الخطـواط، موضـوعة لامـلاك مـن: القرى، والمزارع، والبساتين، والرباطات، والعقار، والطواحين، وفقما فصل كل في محاضر، وسجلات معتبرات المضاة لـدى الحكـام المعتـبرين، لمـن هـو سـلالة الامراء العظام، وفذلكة الولاة الفخام، مقرب الخاقان، علـى اكـبر خـان، شـرف الملك، النائب لحكومة مملكة كردستان. ومـن المطلعـين لمـا في بعـض الاضـلاع الاحقر الأثيم (عبده الراجى محمد).

★ ★ ★

٦٨ـ فهرسـت امـلاك سـركار، عظمـت مـدار، مقـرب الخاقـان، علـى اكـبر خـان شرف الملك ونائـب الحكومـهء كردسـتان ـ دام مجـده العـالى ـ صـحيح ومعتـبر است، وبـا قبالـه ونواشـتجات اصـل بطـور اجمـال وتفـصيل موافـق ومطـابق است. حرره (عنايت الله الحسينى).

★ ★ ★

٦٩ـ فهرست املاك سـركار، عظمـت مـدار، مقـرب الخاقـان شـرف الملـك ـ دام اجلالـه ـ مطـابق وموافـق قبالجـات مفـصله ومـشروحهء ممهـوره ومختومـه وموشحه بخط ومهر حكام شريعت مطهرهء نبويه، موافقه لما في الواقع، وما لها من دافع. حرره الاقل (عبدالله). (محمد رضا...).

★ ★ ★

٧٠ـ فهرست املاك سركار، شوكت مدار، كثير الاقتدار، امير الامراء العظام، على اكبر خان، شرف الملك ـ دام اقباله ـ مطابق وموافق نوشتجات وبنجاقات معتبره ومحكوم بها است، كه در حضور اهالى شريعت مطهره بقانون وميزان شرع انتقال پـــذيرفته. حرره الداعى الجانى في شهر ذى القعدة سنة ١٢٩٢ (لا اله الا الله الملك الحق المبين. عبده مهدى).

★ ★ ★

٧١ـ فهرست قبالهجات املاك سركار، عظمت مدار، مقرب الخاقان، على اكبر خان، شرف الملك، ونائب الحكومهء كردستان ـ دام مجده العالى ـ صحيح ومعتبر ومطابق وموافق سجلات وقبالجات حكام شرع مطاع است. حرره الداعى الجانى (عبده الراجى محمد امين).

★ ★ ★

٧٢ـ فهرست املاك سركار، باعز وقار، عظمت مدار، كثير الاقتدار، امير الامراء العظام، زبدة الولاة الفخام، مقرب الخاقان، شرف الملك نائب الحكومهء ولايت كردستان ـ دام مجده العالى ـ مطابق وموافق با اصل قبالجات، معتبرهء ممهوره بمهر حكام شرع مطاع قديم وجديد است. وانا الداعى الاقل (عبده محمدو) حفيد مرحوم ملا محمد.

★ ★ ★

٧٣ـ فهرست املاك سركار، شوكتمدار، مقرب الخاقان، على اكبر خان، شرف الملك، ونائب الحكومهء كردستان، مطابق اصل قبالجات وصحيح ومعتبر است. (لا اله الا الله الحق المبين عبده محمد رضا)

★ ★ ★

٧٤ـ فهرست املاكات سركار، مقرب الخاقان، بندگان عالى شرف الملك ـ مد ظله العالى ـ موافق ومطابق با اصل قبالجات وصحيح ومعتبر است. الحقير (حبيب الله ابن عباسقلى).

★ ★ ★

٧٥ـ فهرست املاك سركار، نتيجة الولاة العظام، امير الامـراء الفخـام، مقـرب الخاقـان، سـركار بنـدگـان عـالى، شـرف الملـك ـ دام اقبالـه المتعـالى ـ مطـابق وموافق با اصل قباله‌جات معتـبره، صـحيح ومعتـبر اسـت. (حـسن علـى ابـن خان احمد).

★ ★ ★

٧٦ـ هذه فهرس الاملاك والبقاع والقرى والضياع، والمزارع والمحلات والخانات والعمارات وغيرها... لامير الامراء العظـام، مقـرب الخاقـان، مـؤتمن الـسلطان، شـرف الملـك ـ ادامـه الله الـرحمن ـ مجمـلا مـن مفـصل سـجلات وصـكوك لا تعتريهـا الـسترات والـشكوك. حـرره الفقـير الراجـى (محمـد صـالح بـن محمـد مهدى).

★ ★ ★

٧٧ـ فهرست املاك سركار، شوكت مدار، امير الامراء العظام ـ مقرب الخاقـان ـ على اكبر خان، شرف الملك، ونائب الحكومهء كردستان ـ دام مجده ـ صحيح ومعتبر ومطابق وموافق سجلات وقبالجات حكـام شـرع مطـاع اسـت. حـرره الداعي الجاني (عبده الراجى محمد امين).

★ ★ ★

٧٨ـ فهرست املاك مقرب الخاقان، شرف الملك، معتبر است، (يـا مـن هـو مـن رجاه كريم).

★ ★ ★

٧٩ـ فهرست املاك سركار عظمت مدار، نـبذة الامراء العظام، مقرب الخاقان، على اكبر خان، شرف الملك، ونائب الحكومهء كردسـتان ـ دام مجـده ـ صـحيح ومعتـبر وباقبالـه وصـكوك وسـجلات اصل بطريـق اجمـال وتفـصيل موافـق ومطابق است، وكـثيرى از معـاملات ومبيعـات مـسطوره بـاطلاع داعـى دوام دولت قاهره وقوع وجريان يافته. بقيه هم بر وفق نوشتجات حكام واهـالى شريعت مقدسه گـذشته. حـرره الـداعى الجـانى في ذي القعـدة الحـرام سـنة ١٢٩٢ (افوض امرى الى الله عبده لطف الله)[١٨].

* * *

**٨٠ـ فهرست املاك مقرب الخاقان على اكبر خان شرف الملك ممهور بمهور علما واشراف معتبر است. الداعی (محمد بن امان الله).**

* * *

**٨١ـ فهرست قبالەجات املاك سركار، مقرب الخاقان، على اكبر خان، شرف الملك، صحيح وموافق قبالەجات معتبر است. في شهر ذي حجة الكرام. ١٢٩٢ (حسن قلى ابن امان الله).**

* * *

**پەراوێز:**

**(١) بڕوانە: گۆڤاری (رامان) ژمارە (١١٦). هەروەها بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە، بەرگی هەشتەم، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل: ٣١٦.**

**(٢) بڕوانە: گنجینەء اسناد، فصلنامەء تحقيقات تأريخي، سال پانزدهم ـ دفتر اول، بها ١٣٨٤. شمارەء ٥٧.**

**(٣) لەوانە: گۆڤاری گەلاوێژی عەرەبی و، گۆڤاری سلێمانی و، گۆڤاری رامان.**

**(٤) بڕوانە: تألیف فاضل شهیر حضرت آیت الله شیخ محمد مردوخ كردستانی. تهران، نشر كارنگ، ١٣٧٩ ل: ٤٢٨، ٤٤١، ٤٤٤، ٤٤٦، ٤٥٣.**

**(٥) ئەم ناوانەم لە مامۆستا سەييد باقری هاشمی وەرگرت، لە ساغكردنەوە و خوێندنەوەی دەقەكەشدا یارمەتی دام.**

**(٦) درێژییەكی سێ مەتر زیاترە، بەڵام نزیكەی سێ مەتری نووسراوی تێدایە، ئەوەكەی دی بە جۆگەلە جۆگەلەیی و بە سپێتی هێڵراوەتەوە، لەوانەیە بەهیوای ئەوە بووبێت ئەو بەشەیش بە قەباڵە و سەنەدی كڕینی موڵك پڕ بكاتەوە.**

(٧) ئـــەم ژمـــارە بـــەپێی ژمـــارەی نـــاو بەڵگەنامەکەیـــە، واتـــە دەق و نووسـینی (٢٧) قەباڵـەم - دوای سـێیەم - بـواردوە و هاتوومەتـە سـەر (٣٠) هەم.
(٨) مووساخان کوڕی محەمەد صادق خانی ئەردەڵان بووە، واتە برای عـەلی ئەکبەر خانی (شرف الملك) بووە.
(٩) فـەرەجوڵڵا (شـێخ فـەرەجوڵڵا خـان) کـوڕی محەمـەد صـادق خـانی ئەردەڵان، لەبەر ئەوە زۆر بـەدین و خـودا نـاس بـووە پێیـان وتـووە (شـێخ فەرەجوڵڵا خان).
(١٠)لـەناو ئـەم دەقـەدا چـەند جـار نـاوی مـەحموود هـاتووە یـەکێکیان مەحموود خانی کوڕی عەلی ئەکبەر خانی (شرف الملك) بووە.
(١١) چـەند محەمـەدیش ناویـان هـاتووە، یـەکێکیان خـەڵکی پـاوە و لـە مـەعاذییـەکانی پـاوە بـووە، لـەناو ئـەو مـەعاذییانـەدا زانـا و کوێخـا و دەمـچەرموو هـەبووە. لـەم دواییـەدا بەرهـەمی (حـاجی صـادقی پـاوەیی مەعاذیی)م دۆزییەوە. (بڕوانە: بووژاندنەوەی مێـژووی زانایـانی کـورد لـە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە، بەرگی حەوتەم، ل: ٢٢٤).
(١٢) محەمەد ڕەضا خان کوڕی محەمەد صادق خانی ئەردەڵان بووە.
(١٣) شێخ عەبدولمولئمینی دووەم کوڕی شێخ جەمالەدینی یەکەم، زانایـەکی بـەتوانا لـە زانسـتەکانی سـەردەمی خۆیـدا، بەتایبـەتی لـە گەردوونناسـی و هەیئەت و هەندەسەدا بووە، پیاوێکی لەخوا ترس و بە پارێز بووە، چـەند دانراویشی هەبووە، لەوانە (الدر النظيم) هەروەها ئەم مامۆستا کۆکـەرەوە و نووسـەرەوەی کەشـکۆڵی شـێخ عەبدولمولئمینـە کـە مامۆسـتا ئـەنوەری سوڵتانیی بە لێکۆڵینەوەوە ساڵی ١٩٩٨ لە لەنـدەن چاپی کـردووە. مامۆسـتا شێخ عەبدولمولئمین ساڵی ١١٥٢ لەدایك بووە، ساڵی ١٢١١ لە جیهان دەرچووە.
(١٤) محەمەد جەعفەر خانیش کوڕی محەمەد صادق خانی ئەردەڵان بووە.
(١٥) عەبدولعـەزیزی حوسـەینی: لەوانەیـە عەبدولعـەزیزی کـوڕی سـەیید عەبدولەجیدی (ناظم السادات) شێخولئیسلامی سنە بێت. کە پیاوێکی زانا

و بـەتوانا و لێهـاتوو بـووە. لای مامۆسـتا مـەلا عەبـدوڵڵای مـوفتیی دشـە خوێندنی تەواو کردووە. سەرەتا لەشاری سنەدا بە ئیمامـەت و تـەدریس و دواتـر بـە شێخولئیـسلامیی خـەریك بـووە. شـاعیر و ئـەدیبیش بـووە، بـە زمانەکانی فارسی و عەرەبی شیعری ناسکی گوتووە. ساڵی ١٢٨١ك هاتووەتـە دنیا و ساڵی ١٣٥٧ك کۆچی دوایی کردووە. (مشاهیر کرد ٢/ ٢٢٤).

(١٦) محەمەدی کوڕی ئیمامەدین زانایـەکی گـەورە و پایـە بڵنـد و شـاعیر و ئەدیب بووە، کوڕی ئیمامـەدینی زانـای نـاوداری شـاری سـنە بـووە. شـیعری ناسك و جوانی بە فارسی و کوردی بـووە. نازنـاوی شـیعری حـەیران بـووە، بـە فەخرولعولـەما ناسـراوە. سـاڵی ١٢٩٩ك بـەبێ نـەوە و منـداڵ سـەری ناوەتەوە و ماڵئاوایی لە جیهان کردووە.

(بڕوانە: شاعیران کرد پارسی گۆیی، عبدالحمید حیرت سجادی ل: ٢٥٤).

(١٧) مەلا هادی لە مامۆستایان و قازییانی جوانڕۆ بووە.

(١٨) مەلا لوطفـوڵڵای شێخولئیـسلام کـوڕی مـەلا فـەتحوڵڵای قـازیی کـوڕی مەلا ئیبراهیمی کوڕی مـەلا حـسەینی قـازیی، ناسـراوترین و بـەتوانا تـرین کەسـی خانـەوادەی قـازیی و والییـەکانی شـاری سـنە بـووە. زیـاد لـەباری زانستی پیاوێکی کۆمەڵایەتی تاقانەی چەرخی خۆی بووە، شاعیریش بووە، زیـاد لـەوەی کـە زانایـانی سـنە بـە پـرس و ڕای ئـەو جووڵانەتـەوە، شـای قاجـاریش بـێ ئاگـادارییی ئـەو دەسـتکاریی دانـان و لابردنـی فەرمانـدەکانی ناوچـەکەی نـەکردووە. سـاڵی ١٢٥١ هاتووەتـە جیهـان، سـاڵی ١٣١٥ك کۆچـی دوایی کردووە.

(مشاهیر کرد ٢/ ٥٧).




رشتەی فەرمانڕەوایانی ئەردەڵان

## خلاصة البحث

**محمد علي القرەداغي**
العضو العامل في الأكاديمية الكوردية – اربيل

برز في ولاية اردلان رجل متنفذ وذو سلطان وهو علي أكبرخان (شرف الملك) لفترة من الزمن ١٢٩١ هـ ـ ١٨٧٤ـ م/ ١٣٣٠ هـ ـ ١٩١١م.

ويبدو ان هذا الرجل مع سعيه في ادارة المناطق التي تناط به ادارتها وعمله على استتباب الأمن في المناطق التي يتواجد فيها، وردّ العدوان والمخاطر عنها.. كان - من الجانب الآخر ـ يسعى لتوسيع املاكه وعقاراته وضيعه، واشترى لذلك عددا غير قليل من القرى والاراضي والطواحين وغيرها من الاموال غير المنقولة، هذا عدا الزرابي والسجاجيد والفرش واثاث البيت الفاخرة والنادرة.

ولحرصة على هذه الاملاك والعقارات، والاحتفاظ بها وعدم التفريط بشيء منها، كتب واجرى عقودا شرعية وقانونية لها، وعندما كثرت العقود وتعددت الحجج وخشي على ضياع بعض منها، جمعها في وثيقة كبيرة، وأشهد عليها الكثير من العلماء والقضاة ورجال الافتاء والكسبة والتجار.

ومهما كان حرصه عليها شديدا فإنه قد تركها وقسمت بين الورثة وذهبت الى هذا وذاك، ولا يهمنا شيء من ذلك عدا الدرس البليغ الذي يؤخذ منه: ان الانسان مهما جمع من الاموال ومهما اشتد حرصه على الاقتناء والاكتناز فإنه لابد انه تاركها يوما من الايام طال أم قصر.

كما يهمنا عدا هذا من هذه الوثيقة انه اشهد عليها ـ كما قلنا ـ عددا غير قليل من العلماء والوجهاء، وان تأريخ كثير منهم غير معروف، او ليس لهم ذكر في المصادر التي بحوزتنا، وهذه الوثيقة تحتفظ بتواريخ واسماء وعناوين الوظائف واماكن التوجد لكثير من الاشخاص الذين وردت اسماؤهم في الوثيقة. فتكون هذه الوثيقة ـ من هذا الجانب ـ مصدراً كبيراً وموثوقا يساعد مع المصادر الاخرى على معرفة تواريخ اولئك الاعلام.

# دیکارت و ئەقلانییەت

**م. ڕێبوار حەمە ئەمین حەسەن سیوەیلی**
بەشی فەلسەفە، کۆلێژی ئەدەبیات، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر

**(بەشی یەکەم)**

**پێشەکی**

سالّی ٢٠٠٥ بۆ یەکەمجار سێ بەرهەمی ڕێنێیە دیکارت، وەرگێڕدرانە سەر زمانی کوردی و ئەمەش بە ڕووداوێکی فەلسەفیی گرنگی ناو زمان و ڕۆشنبیریی ئێمەی کوردزمان دادەنرێ[1] ئەو بەرهەمانە بریتین لە: ڕامانە میتافیزیکییەکان (١٦٤٢)، لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی بەکارهێنانی ڕاستیی ژیری و توێژینەوەی زانستی (١٦٣٧)، لەگەڵ بنەڕەتەکانی فەلسەفە (١٦٤٤). ئەو بەرهەمانە جگە لەوەی بۆخۆیان بە زمانی فەلسەفەی نوێ[2] نووسراون و فەلسەفەیان بە قۆناغی مۆدێرنی خۆی گەیاند و دیکارتیان کردە "باوك"ی ئەم فەلسەفە نوێیە، ئاواش وەرگێڕانیان بۆ هەر زمانێك، گەواهی زیندوویی ئەو زمانە دەدات و ئامادەی دەکات بۆ دەربڕینەوەی هزری فەلسەفیی مۆدێرن، وەك ئەوەی دیکارت بیری پێدەکردەوە. دیکارت بەوەی لەسەردەمی خۆیدا پتر بەرهەمەکانی بە زمانی باوی ڕۆژگار، کە زمانی لاتینی و پاشماوەی نەریتی پێنووسینی سەدەکانی ناوەڕاست بوو، بلاو نەکردنەوە و لە جیاتی ئەوە کەوتە بیرکردنەوە و نووسین بە زمانی فەرەنسی، کە زمانی نەتەوەیی بوو، فەلسەفەی لە زمانی ستانداردی ئایینی سەدەکانی ناوەڕاست ڕزگار کرد و لە چوارچێوەیەکی ئەمڕۆییتر و ئاساییتردا بیروڕاکانی خۆی بەرجەستە کردن. بەم کارەشی هەنگاوێکی زۆر گرنگی لە بواری نزیکخستنەوەی مرۆڤی ئاسایی و فەلسەفە، هەڵهێنایەوە و جارێکی دیکە پەیوەندیی ژیان و فەلسەفەی توندوتۆڵ کردەوە. بۆیە هەر هەوڵێك بۆ

ئاشناکردنەوەی فەلسەفە و مرۆڤ بەیەکتر و هەر کۆششێك بۆ بەرجەستەکردنی هزری فەلسەفی لە زمانی نەتەوەییدا، خۆبەخۆ هەوڵێکی دیکارتیانەیە و ڕووداوێکە لە ناو زمانی نەتەوەییدا.

ئەم لێکۆڵینەوەیەی لێرەدا پێشکەش دەکرێ، دەیەوێ سەرەتایەکی هێمنانە بێت بۆ چوونەوە سەر هەندێ لایەنی بیری دیکارت و هاندانی خوێنەران و قوتابیان بێت بۆ گەڕانەوە سەر دەقی بنەڕەتیی دیکارت. ئەمەش لەو ڕوانگەیەوە، کە گەڕانەوە بۆ دەقەکانی دیکارت و خوێندنەوەیان بە زمانی دایك، بۆ خۆڕاهێنان لەسەر بیرکردنەوەی فەلسەفی و زیادکردنی هەستی ڕەخنەکاریمان لە ئاست ژیانی ڕۆژانەدا، کۆمەکێکی زۆرمان دەکات، کە تاکو ئێستا لەلایەن زەین و تێگەیشتنی ڕەمەکییەوە بەشێوەیەکی ساکار، ئیدراك دەکرێ.

**میتۆد و کێشەی باس:**

کێشەی سەرەکیی ئەم نووسراوە، بریتییە لە خستنە ڕووی هەندێ لایەنی فەلسەفەی ئەقلانیی دیکارت و چۆنایەتی بیرکردنەوەی دیکارت لە چوارچێوەی زمانی کوردی و بەگەڕانەوە بۆ سەرچاوە سەرەکییەکانی دیکارت، خۆی. گریمانەی ئەوە کراوە، ***بەگەڕانەوە بۆ بەرهەمە فەلسەفییە گرنگەکانی دیکارت، دەتوانرێ لە چۆنایەتی بیرکردنەوەکەی بەپێی شیاوەکی و توانای زمانی خۆمان، تێیبگەین.*** ئەگەر ئەم گریمانەیە ڕاست بێت ئەوە هەم زمانی نەتەوەیی خۆمان خستۆتە بەردەم تاقیکردنەوەیەکی فەلسەفیانە و هەم کەمەکێ زیاتریش لە چۆنێتی بیرکردنەوەی دیکارت چووینەتە پێش، کە ئەوەش دەستکەوتێکە و بۆ توێژینەوەکانی پاشتر سوودی هەیە..

چوارچێوەی میتۆدیی ئەم باسە، بەپێی بەشەکان و لە ڕەوتی باسەکەدا کەمێ گۆڕانی بەسەردا دێت. لەبەشی یەکەمدا، پشت بە هەندێ چەمکی بواری مرۆڤناسی زمان و مرۆڤناسی فەلسەفی و کەلتووری دەبەستێ، ئەوەش لەلایەکەوە، لە پێناوی دەستنیشانکردنی ئەو پەیوەندیەی لە

نێوان زمانی بەکارهاتووی ڕۆژانە و شێوەی بیرکردنەوەدا هەیە، و لە لایەکی ترەوە بۆ ئاماژەدان بەو ڕێگرانەی کە لەناو زمانی کوردیدا ئامادەن و دەلالاتی تایبەت بە زاراوەی ئەقڵ، یان ژیر دەبەخشن، کە مەرج نییە مانای ئەو دەلالەتانە بمانبەنەوە سەر مانا و دەلالەتە فەلسەفییەکانیان، بەو مانایەی کە پاشتر لەلای دیکارت و لە بەکارهێنانی ئەودا بۆ چەمکی ئەقڵ دەیبینینەوە. وەستان لەسەر ئەم ئیشکالیەتە ناوەکییەی زمان بۆ ئێمە گرنگیی تایبەتی هەیە، چونکە دەبوو هەر لەسەرەتاوە خۆمان لەگەڵ مانای وشەی (ئەقڵ) بەو جۆرەی لە زمانی کوردیدا بەکار دەهێنرێت و لەگەڵ مانا فەلسەفییە دیکارتیانەکەی، یەکالا بکەینەوە. ئەمەش کارێکی پڕ زەحمەت و ماندووکەرە، چونکە سەرچاوە و توێژینەوەی پێشینە، لەم زەمینەیەدا نییە و لە زۆرینەی هەرەزۆری ئەو بەرهەمانەشدا کە لەبارەی فەلسەفەوە بەزمانی کوردی نووسراون، یان وەرگێڕدراون، ئەم مەسەلەیە یەکالا نەکراوەتەوە. لەبەر ئەوەی قسەکردنی ئێمە لەسەر ئەقڵانییەتە لەلای دیکارت، بە زمانی کوردی، کەواتە دەبوو سەرەتا لەوە بکۆڵینەوە، کە مانای وشەی ئەقڵ لەناو زمانی کوردیدا چۆنە و چەند مانای هەیە و چۆن بەکاردەهێنرێت.

لەدوای ئەمە و لە بەشەکانی تردا، دەکەوینە کارکردن بە میتۆدێکی شیکاریانەی ڕەخنەیی بۆ ئەوەی هەم شیکاری بیرۆکە و ئایدیا فەلسەفییەکانی دیکارت بکرێ و هەم زەمینەش خۆشبکرێ تاکو لە ئەنجامەکاندا هەندێ پرسیار و ڕەخنە لەبارەیانەوە بخرێتە ڕوو. لە بەشی دووەمدا بەبێ ڕەچاوکردنی میتۆدی مێژوویی و چوونە ناو وردەکارییەوە، بە کورتی باسی هەندێ ویستگەی ژیانی دیکارت و ستایلی نووسینیمان کردووە و هەڵسەنگاندنمان بۆ کردووە. لە بەشی سێیەمیشدا، میتۆدی دیکارت کە بە میتۆدی گومانکاری ناسراوە، لەگەڵ گرنگترین چەمکە فەلسەفییەکانیمان شیکردوونەتەوە، وەك چەمکی (بیرۆکە زگماکەکان، بوونی خودا و دوالیزمی دیکارتی). پاشانیش لە هەڵسەنگاندن و

پێشنیارەکانماندا، هەستاوین بە بەستنەوەی بەشی یەکەمی باسەکەمان کە بریتیبوو لە بەکارهێنان و پۆلێنکردنەکانی چەمکی ئەقڵ لە زمانی کوردیدا، بە تێگەیشتنی دیکارت بۆ چەمکی ئەقلانییەت و هەندێ ئەنجامیمان بەدەست هێناوە.

وێڕای هەموو ئەمانەش پێویستە بگوترێ، ئەم باسە جگە لەوەی خوازیارە دەروازەیەك و خوێندنەوەیەکی گشتی بێت بۆ پێکهاتە و بەشە گرنگەکانی هزری ئەقلانیی دیکارت و پێکەوە بەستنەوەیان لە فۆرمێکی شیاوی لۆژیکیانەدا، ئەوە لەهەموو بەشەکانی ئەم نووسینەدا لایەنی پەروەردەکارانەی بابەتەکە لەبیر نەکراوە و خۆ لە ئاڵۆزکردنی مەسەلەکان بەدوور گیراوە. مەبەستیش ئەوەیە بەشێوەیەکی ورد و شەففاف هاوکارییەکی ئەو خوێنەر و قوتابیانە بکرێت، کە بەتەواوی لەبارەی دیکارتەوە شارەزا نین.

سەبارەت بەوەی بۆچی باسی لایەنەکانی دیکەی کارەکانی دیکارتمان لە بواری ماتماتیك و فیزیکدا، نەکردووە، دەگەڕێتەوە بۆ پابەندبوونمان بەو دەقە بە کوردی کراوانەی دیکارت، کە بوونەتە سەرچاوەی سەرەکی ئێمە و نامانەوێ لەچوارچێوەی باسەکە، کە فەلسەفەیە بچینە دەرێ. هەروەها سەرچاوەی بنەڕەتی ئێمە بۆ بەدواداچوون و پشتڕاستکردنەوەی ئەو بیروڕا فەلسەفییانەی دیکارت، کە لەو سێ کتێبە بە کوردیکراوەیدا نووسیونی، کتێبە گرنگەکەیەتی بەناوی (ناڕەزایەتییەکان و وەڵامەکان). ئەم کتێبەی دیکارت گرنگییەکی زۆری بۆ باسەکەی ئێمە هەیە، چونکە دیکارت لەم بەرهەمەیدا وەڵامی کۆی ئەو ڕەخنانەی داوەتەوە کە هاوچەرخەکانی خۆی ئاراستەی بیروڕاکانیان کردووە و زۆر بابەتی گرنگیشی خستۆتە سەر بیروڕاکانی پێشتری..

لە بەکارهێنانی سەرچاوەکانی تردا، هەوڵمانداوە ئەوانەیان لێ هەڵبژێرین کە جێگەی متمانەن و لە ڕوانگەی ئایدیۆلۆژییەوە بۆ باتەکە ناچن و سیاسەت تێکەڵی فەلسەفە ناکەن و توێژینەوە هاوچەرخەکان

پشتیان پێدەبەستن. هەروەها نەشمان ویستووە زۆر خۆمان بەوانەیانەوە سەرقاڵ بکەین، کە دەچنە خانەی "مێژووی فەلسەفە"ی ڕووتەوە، چونکە میتۆدە شیکارییە ڕەخنەییەکەی بەکارمان هێناوە، ڕێگەی ئەوەمان پێنادات.

سەبارەت بە چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ دەقە وەرگێڕدراوەکانی دیکارت بۆ هەرسێ زمانی کوردی، فارسی و ئینگلیزی و سوودگەیاندنیان بە پرۆسەی خوێندنەوەی خوێنەر، پێویستە لێرەدا ڕوونکردنەوەیەك بدرێ:

هەرکاتێ لەدەقەکانی دیکارتەوە ڕستە و دەستەواژەکان ڕادەگوێزم، پشت بە زیاد لە وەرگێڕانێك دەبەستم، بەڵام سەرچاوەی سەرەکیم وەرگێڕانە کوردی، فارسی و ئینگلیزیەکانە، کە لە شوێنی خۆیدا ئاماژەیان پێدەدرێ. مەبەستم لە ئاماژەدان بە زیاد لە وەرگێڕدراوێکی هەمان دەقی دیکارت، نزیکخستنەوەی هەرە زیاتری خوێنەرە لەوەی دیکارت بیری لێکردۆتەوە. ئەگەرچی ئەمە هەوڵدانێکی ماندووکەرە، بەڵام پێویستە، چونکە ئێمە دەزانین کە وەرگێڕان پرۆسەیەکی ئاسان نییە و گەیشتنی مانای بنەڕەتی بەهۆی وەرگێڕانەوە، شتێکی ڕێژەییە و هیچ وەرگێڕێك و هیچ زمانێکی مەبەست ناتوانن بە تەنیا مانای بنەڕەتی بگەیەنن. ئەمەش لەبەر ئەوەی کە زمانەکان سروشتی دەربڕینی تایبەت بەخۆیان هەیە و وەرگێڕانیش وێڕای ئەوەی پرۆسەیەکی زانستییە، ئاواش پەیوەستە بە هەستی جوانکاری و سەلیقەی تایبەتی وەرگێڕەوە. بۆیە کاتێك هەمان دەق دەخوێنینەوە کە لەلایەن چەند وەرگێڕەوە بۆ چەند زمانی جیاواز، یان بۆ هەمان زمان تەرجەمە کراوە، ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ کە هەر یەك لە سروشتی زمانە جیاوازەکان و سەلیقەی جیاوازی وەرگێڕەکان و زەمەنی وەرگێڕانەکانیش، شوێندەستی خۆیان بە دەقە وەرگێڕدراوەکەوە، جێهێشتووە.

هەروەها سەبارەت بە وەرگرتن و ئاماژەدان بە سەرچاوەکان، بەتایبەتی دەقە فەلسەفییەکانی دیکارت، مەبەستم بووە زۆرترین ئاماژەیان پێبدەم و لە زمان خۆیەوە خوێنەر لە ناوەڕۆکی ئەو لایەنانەی

فەلسەفەی دیکارت ئاگادار بن، کە مەبەستی توێژینەوەکەی ئێمەن. ئەوەی بەلای منەوە لەو وەرگرتن و گواستنەوانەدا، گرنگ بووە، نەك هەر تەنیا ناوەڕۆکی بیرکردنەوەکانی دیکارتە، بەڵکو لە پاڵ ئەوەشدا مەبەستم گەیاندن و ئاشناکردنی ستایل و شێوازی دەربڕینی دیکارتیانەش بووە بە خوێنەری کورد. لە هەموو شوێنێکیشدا نەمویستووە وەرگێڕانی بەرهەمەکانی دیکارت بۆ سەر زمانانی ناوچەکە، بکەمە پاڵپشتی باسەکەم، مەگەر لە شوێنێکدا ویستبێتم سەرنجی خوێنەر بۆ جۆری وەرگێڕانەکان ڕابکێشم. سەرچاوەی سەرەکیی من وەرگێڕانە کوردییەکان و کتێبی (نارەزایەتییەکان و وەڵامەکان)ـە، کە پاشتر لە جێگەی جیاوازدا و بە بۆنەی جۆربەجۆرەوە لە گرنگیی ئەم سەرچاوەیە دەدوێین.

## باسی یەکەم

**بەکارهێنانەکانی چەمکی ژیری و ئەقڵ لە زمانی کوردیدا:**

ئەگەر بڕیار بێت لەو چوارچێوەیە تێبگەین کە دیکارت (١٥٩٦-١٦٥٠) فەیلەسوفی فەرەنسی، بیری تێدا دەکردەوە، واچاکە ئەو بزاڤە بناسین کە بە بزاڤی (ڕاشیۆنالیزم Rationalism) بەناوبانگە و لەزمانی عەرەبی و فارسیدا بە (عقلانی و عقلانیت و العقلانية) ناسراوە و دەکرێ ئێمەش عەقلانییەت، ژیرپەسەندی، یان ژیرباوەڕی بۆ بەکار بهێنین.

ئایا بەڕاست باوەڕهێنان بە ژیر، جیاوازی چییە لە بڕواهێنان بە ئەفسانە، لە بڕواهێنان بە ئایین و بە جادوو؟ ئەگەر پەیوەندییەکە لەسەر بنەمای (باوەڕهێنانەوە) بێت، ئایا ئیدی جیاوازیی چییە لەوەی (باوەڕ) بە چی دەهێنین؟ جیاوازی چییە لە نێوان ئەوەی کە شێوازی بیرکردنەوەی دیکارت بە (عەقڵباوەڕی) و ژیرپەسەند، ناو دەبەین و ئەمەش دیکارت دەکاتە (باوکی فەلسەفەی مۆدێرن)، لەگەڵ ئەوەی شێوازی بیرکردنەوەی سیاسەتمەدارێکی تاکڕەو، بە (ستەمکاری) ناودەبەین و ئەمەش سیاسەتەکەی دەیکاتە تۆتالیتاریست، چییە؟

لەجیاتی ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە، ئەگەرچی ڕێگای چوونە ناو جیهانی دیکارتیان بۆ خۆشکردین، وای بەباش دەزانین لەسەرەتاوە بزانین ژیر یان (ئەقڵ) چییە و چی پێدەکرێت، ئەوجا بزانین بۆ وەك باوەڕێك، یان ڕێچکەیەك لەلای دیکارت و پەیڕەوکارانی دەردەکەوێت و بڕوای پێدەهێنرێت؟

لە مێژووی فەلسەفەدا و لە زمانە جیاوازەکاندا، ئەو شتەی ئێمە پێی دەڵێین ژیر، یان ئەقڵ، پێشینەیەکی دوورودرێژی هەیە. وەك لە فەرهەنگەکانی فەلسەفەدا بۆمان دەردەکەوێ، "لە یۆنانی کۆندا بە (dianioa)، یان (logos) و (nous) ناوبراوە. لە زمانی لاتیندا بۆتە، (intelligentia)، (inellectus) یان (ratio)[٣] و لە ئەڵمانیدا کراوەتە (Vernuft) و لە ئینگلیزیدا بۆتە (Reason) و لە فەرەنسیدا (raison, intelligence, intellect)"[٤]. جا لەبەرئەوەی قسەکردنی ئێمەش لەبارەی ئەم چەمکەوە لە چوارچێوەی شیاوەکی دەربڕینی زمانی کوردیدایە، ئەوە وا بەباش دەزانرێ پێش هەمووشتێ بزانین لە ناو ئەم زمانەشدا وشەی ئەقڵ، یان ژیر، بە چ مانایەکە و کاتێ کوردزمانەکان ئەو وشەیە گۆ دەکەن، چی لێ تێدەگەن؟

بۆ چوونە ناو ئەم باسە، میتۆدی ئەو توێژینەوە فەلسەفی و ئەنترۆپۆلۆژیانەی قسە لە پەیوەندی نێوان زمان و واقیع، دەکەن زۆر سوودمەندن[٥].

کوردەکان وشەی ئەقڵ و عاقڵ و ژیر زۆر بەکار دەهێنن و هەر لەسەرەتای منداڵییەوە ئەم وشانە بەگوێی منداڵەکانیاندا دەخوێنن و ڕامیان دەکەن بۆ ئەوەی ژیر و ئاقڵ بن.. لە بەکارهێنانی ڕۆژانەی زمانی هاوچەرخی کوردیدا، وشەی ژیری، فامیدە، تێگەیشتوو، کامڵ، ئەقڵ و عەقڵ و عاقڵ و ئەقڵانییەت، دەلالەتی جۆربەجۆریان وەرگرتووە و ئەو وشانە هەریەکەیان لە سرووتی تایبەت و پۆزشنی تایبەتەوە گۆ دەکرێن و جاری واهەیە هاوواتان و جاری واش هەیە بە پێچەوانەوە و زۆرجاریش

تەوا و کەری یەکترن و پێکەوە مانای پڕاوپڕ دەبەخشن. هەمووو ئەمەش، پەیوەستە بەوەی بەکارهێنانەکەیان لە چ بوارێکدایە و لەکاتی بەکارهێنانیاندا بە کامە مانا بارگاوی دەکرێن و قسەکەر، یان نێرەر لە چ پێگەیەکی کۆمەڵایەتی، سیاسی، کەلتوورییەوە قسان دەکات و بەهۆیەوە دەیەوێ چ پەیامێك بە گوێگر، یان وەرگر بگەیەنێت.

لە کەنار ئەم سەرەتایەدا پێویستە ئەوەش بە بیر بهێنرێتەوە، کە لە کوردستاندا هەرگیز زمانێکی ستانداردی ئەوتۆ نەبووە، کە لەکاریگەریی زمان و کەلتوورەکانی تر بەدوور بووبێت (ئەمەش بۆ زۆرینەی زمانەکانی تریش ڕاستە). بەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافیایی وڵاتەکە و چاوی حکومڕانانی دراوسێ لەسەر خاکەکەی، هەمیشە زمانی کوردی کەوتۆتە ژێر کاریگەریی سەردەستەیی زمانانی ترەوە. لێرەشەوە، هەندێك لەو دەلالەتانەی وشەی ئەقڵ و عەقڵانییەت لە زمانی کوردیدا بەخۆیانەوە گرتووە، دەگەڕێتەوە بۆ پێشینەی کاریگەریی زمانی سەردەستەی بێگانە، جا چ ئەوە زمانی عەرەبە مسوڵمانەکان بووبێت، یان زمانی تورکە عوسمانلییەکان بووبێ، یاخود زمانی فارسی، لەسەر زمانی ڕۆژانەی کوردەکان.

لێرەدا هەوڵ دەدەین هەندێ لەو مانایانە لە چوارچێوەیەکی چەمکسازانەی ڕوونتردا بەسەر بکەینەوە، کە بێگومان بیرکردنەوە و کارکردنی زیاتری دەوێ و بۆی هەیە پێویستیش بە دەستکارییەکی وردتر بکات بۆ ئەوەی مانای بەکارهێنانەکانی وشەی ئەقڵ، یان ژیری لە زمانەکەماندا، پتر ڕوون بکرێنەوە.

بەم مانایەش ئەوەی لێرەدا دەخرێتە ڕوو، تەنیا پێشنیارێکە بۆ ڕاڤەکردنی ئەم زاراوەیە لە زمانەکەماندا، بەڵکو یارمەتیشمان بدات بۆ تێگەیشتنێکی زیاتر لەمانا فەلسەفییەکانی و هەروەها ئاشنامان بکات بەو ڕێگرانەی ناو زمانەکەمان، کە ناهێڵن لەمانای فەلسەفییانەی وشەکە، وەك خۆی تێبگەین. چونکە بەکارهێنانی وشەیەك، یان زاراوەیەك لە زمانێکی

تایبەتدا، کە لە کەلتوورێکی تایبەتەوە خۆراك وەردەگرێ و مانای دیاریکراوی خۆی لە ڕوانگەی ڕەگەز: (نێر و مێ)، یان تەمەن: (منداڵ و پیر)، یان ڕەچەڵەك: (ئێمە و ئەوان)، بەسەر زماندا دەسەپێنێ، بۆی هەیە ڕێگر بێ لە بەردەم فراوانبوونی زمانەکە بە مانای تر و بەکارهێنانی لە بواری تردا. بەتایبەتیش کە زۆر توێژینەوەی فەلسەفەی فیمینیستی ئاشکرایان کردووە، کە زمانی زۆرینەی فەیلەسووفەکان خۆشیان، زمانێکی سنووردار و ڕەگەزمەندە و ئەوانیش لە بەکارهێنانی زاراوە و وشەکانی وەك: "کەس/شخص"، "مرۆڤ/انسان" و تەنانەت "ژیر/عقل" و "ژیرباوەڕی/ئەقلانییەت"دا، نێرانە بیریان کردۆتەوە و ڕووی قسەیان تەنیا لە پیاوان بووە[٦].

لەلایەکی ترەوە، وا پێویستە توێژەری بواری هەر لقێکی زانستی، ئاگاداری ئەو سنوورانە بێت کە زمانی هەڕەمەکی و ڕۆژانە جیا دەکاتەوە لە زمانی پسۆڕانەی زانستی. بەبێ ئەم جیاکارەیە بەدەستهێنانی ئەنجامەکان و خستنەڕووی پێشنیار و ڕاسپاردەکان، کورت دەهێنن و بۆی هەیە بە هەڵەماندا ببەن.

جا لەبەرئەوەی ئەم کێشەیەی زمان لە کەلتوورێکی تایبەتدا دووچاری دەبێ، لە هەمان کاتیشدا کێشەی زمانی بیرکردنەوە و کێشەیەکیشە لە بیرکردنەوەی فەلسەفی خۆیدا، ئەوە گرنگە سەرەتا بزانین بۆ توێژینەوە و بیرکردنەوەی فەلسەفی لەناو زمانێکی وەك زمانی کوردیدا چ ڕێگرێك بۆ چەمکە فەلسەفییەکانی وەك ژیر، یان ئەقڵ دروستدەبێت؟

بەهۆی نەبوونی توێژینەوەی پێشتریش لەم بارەیەوە، توێژەرەوە ناچارە سەرەتا پشت بە تێبینیکردن و داتا کۆکردنەوە، لەوەی کە لە ئێستای زمانەکەماندا بەکار دەهێنرێ و گۆدەکرێ، ببەستێ.

لە ئەنجامی وردبوونەوە و بیرکردنەوەش لەو بارودۆخانەی کە تیایدا کوردەکان، وشەی ژیر، ئەقڵ و عاقڵ و عەقلانی، بەکاردەهێنن، توانراوە

پێنج دۆخی بەکارهێنان دەستنیشان بکرێن و بەم جۆرەی کە لێرەدا دەخرێنە ڕوو، لێکتر جودا بکرێنەوە:

١- **تێگەیشتنی ڕەگەزمەندانە:**

ئەمە ئەو بەکارهێنانەیە کە بنچینەکەی لەسەر بنەمای بەرجەستەکردنی ڕەگەزی بکەر بەندە و ئەوەش کە بەکاری دەهێنێ نێرینەیە. بەمانایەکی دیکە، دەتوانرێ بگوترێ کە سروشتی کۆمەڵگا نێرسالارەکان ئەو دەسەڵاتە دەداتە نێرینە، تاکو بتوانێت ناو بۆ کردە و ڕەفتار و گوفتاری "ئەوانیتر" دابنێ، کە دەکەونە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. لەم ڕوانگەیەشەوە، وشەی "ئەقڵ"، یان ژیر لە زماندا بێلایەن و بێڕەگەز نییە و ئەم وشەیە لە بنەمادا ئامرازێکە لە خزمەت بەرجەستەکردنی نێرینەییدا[٧]. بۆ نموونە: هەرکات مێیینە، یان منداڵ کردەوەیەك، یان قسەیەك دەکات، کە لەتەمەن و ڕەگەزی ئەو ناوەشێتەوە و زیاتر هەڵکشانێك و چاولێکەرییەکی تێدایە بەرەو ڕەفتار و کرداری گەورەساڵانی نێرینە، بەو قسە و کردارەی منداڵەکە و مێیینەکە کردوویانە و گوتوویانە، دەگوترێ: "کارێك و قسەیەکی ئاقڵانە"، یان "ژیرانەیان" کردووە. بۆ نموونە، مێرد بە ژنی خۆی دەڵێت: (بەڕاستی.. ئەم قسەیەت ئاقڵانە بوو)، کە پێدەچێت ناوەڕۆکی ئەم دەربڕینە ئەوە بگەیەنێ، کە ژنەکە لە ئاست، یان شوێنگەی ژیریی نێر، یان پیاودا قسەی کردووە، چونکە بەپێی لەخۆتێگەیشتنی کۆمەڵگا باوکسالارەکان، تەنیا نێر، یان مێرد و پیاو، خاوەنی ژیریی کامڵن. بەم جۆرەش هەمیشە لەم بەکارهێنانەدا، وشەی ئەقڵ شتێکە ڕەگەزمەند و پەیوەستیشە بە قۆناغێکی دیاریکراوی تەمەنەوە. ئاقڵەکان، هەم نێرن و هەم بەتەمەن. ئاقڵانی کەم تەمەن و مێیینە هەمیشە بە گومانەوە تەماشایان دەکرێ.

بۆیە ئەگەر بمانەوێ بۆ ساتێك بە چەمکەکانی مرۆڤناسیی کەلتووری بیر بکەینەوە و بۆ مەبەستەکەی خۆمان، کە چۆنێتی بەکارهێنانی زاراوەی ئەقڵە لە زمانی کوردیدا، سوودی لێ وەربگرین، دەتوانین بگەینە

ئەوەی بڵێین: ئەم تێگەیشتنە لە مانای وشەی ئەقڵ، پێشینەیەکی قووڵی لە زەینییەت و سیستەمی چەمکسازی کۆمەڵگای لادێنشینی فیودالیدا هەیە و ئەقڵ و ژیر، وشەیەکە، ماناکەی لەم عەشیرەت و خێڵەوە بۆ ئەو عەشیرەت و خێڵی تر، گۆڕانی بەسەردا دێت[٨].

هەروەها بەکارهێنانی ئەم وشەیە ئاشکراکەری **"پێگە"** **(position)** و **"دەسەڵات"**(power)ی قسەکەرەکەیەتی، کە لە بواری توێژینەوەی مرۆڤناسیی کەلتووری و بەتایبەتی مرۆڤناسیی زماندا، گرنگی پێدەدرێت. چونکە بەپێی ڕوانگەکانی ئەنترۆپۆلۆژیای کەلتووری، هەم **"پێگەی کۆمەڵایەتی و هەم جیاوازیی ڕەگەزیی (نێر/مێ)، کاریگەرییەکی زۆریان هەیە لەسەر بەکارهێنانی زمان". "هەژاران و دەوڵەمەندەکان، خوێندەوار و نەخوێندەواران، کە بە زاراوە و وشەی جیاواز قسان دەکەن"**[٩]، وەکو یەکتر بیر ناکەنەوە. ئەمە جگە لەوەی ئەو جیاوازییە ڕەگەزییەی کە کەلتوور لە نێوان نێر و مێدا دروستی دەکات، دەشبێتە هۆی دەستنیشانکردنی بونیادی بەکارهێنانی زمان لەلای هەردوو ڕەگەز[١٠]. بۆیە نەک هەر خێڵ و عەشیرەتە هاوپەیمانەکان، بەڵکو نێرینە و گەورەساڵانیش، بەپێی جیاوازیی ڕەگەزی و پێگەی کۆمەڵایەتی و تەمەنی خۆیان و پەیوەندییان لەگەڵیاندا، ئەوانیتر بە "ئاقڵ"، "ژیر"، "سەلار" و "خانەدان"، ناو دەبەن و دوژمن و نەیارەکانیشیان بە "نەفام" و "بێ ئەقڵ" و "بێ ئەسڵ و فەسڵ" و هتد.

لە زمانی کوردیشدا دەستەواژەی (***پیاو دوژمنەکەشی عاقڵ بێت هەر خۆشە***)، ئاماژە بەو مانایەی ئەقڵ و ژیری دەکات، کە ئەم وشەیە لە زمانەکەماندا هەیەتی. هەروەها کاتێ دەگوترێ: (***پیاو دەم ناخاتە دەمی زەعیفەوە***)، واتە پیاو وەڵامی مێیینە ناداتەوە، چونکە پیاو ئاقڵ و زەعیفە کەم ئەقڵە، لێرەشدا ئەقڵ و ئاقڵی سنوورێکە بۆ خۆجیاکردنەوە و فەزڵی (ئێمە)ی خاوەن پێگە و دەسەڵات دەدات بەسەر (ئەوانیتر)ی بێ پێگە و دەسەڵاتدا[١١]. لەهەمان کاتیشدا دەستنیشانی ئەوانە دەکات کە

توانیویانــــە وەك (گەورەســــالآن) و (نێرینــــە) ئاقڵــــە خــــاوەن پێگــــە و بەدەسەلآتەکان، خۆیان بنوێنن و ئەمەش بواری ئەوەی بۆ ڕەخساندوون تاکو لە گۆکردنی وشەی (ئەقڵ)دا، پاداشت و ستایش بۆ ئەو کەسانە بنێرن، کە لە پێگە و دەسەلآتدا لە خۆیان نزمترن. وەك بە ئاقڵ ناوبردنی خاوەن زەوی بۆ جوتیار، ئاغا بۆ دەستوپێوەند، باوك بۆ منداڵ، مێرد بۆ ژن و مەلا بۆ فەقێ و هتد.

٢- **تێگەیشتنی بالآخوازانە:**

لەم تێگەیشتنەدا، بەپلەی یەکەم ئاقڵ: مرۆڤی دانایە و پێچەوانەکەی شێت، یان ئاژەڵە و بەتایبەتیش (کەر)ە. ئەگەر شێت بوو، ئەوە بەزەیی لە ئارادایە، چونکە مرۆڤی ئاقڵ لە ئاست ئەقڵ نقوستاندا، بەزەیی دەنوێنێ. ئەگەر ئاژەڵیش بوو، ئەوە بەراورد لە ئارادایە. لە کەلتووری گشتی کۆمەڵگای ئێمەدا، ئەمە تێگەیشتنێکی سووکایەتی پێکەرانەیە بە ئەقڵ و ژیر: چونکە لەو دیو ئاقڵ و عەقڵەوە، ناعاقڵ نییە، بەڵکو شێتی و حەیوانییەت هەیە و چ شێت و چ ئاژەڵیش نزمترن لە مرۆڤی دانا. بەلآم ئەم تێگەیشتنە لە هەمان کاتدا تێگەیشتنێکی بالآخوازانەیە لە تاکە مرۆڤ، چونکە کەسی ئاقڵ، شێت و ئاژەڵ نییە و بە دڵنیاییشەوە، (کەر) نییە.

ئەم ڕێسایە وەك ڕیزپەڕێك (استثناء) لەلایەن (نالی)ی شاعیرەوە هەڵدەوەشێتەوە[١٢]. ئەو لە زمان کەرێکەوە کە بە "زوبانی حاڵی"[١٣] پێیگوتووە: "ئەی نالی، من و تۆ هەردوو حەیوانین، وەلێ تۆ گوێیەکانت کورتن و من گوێیەکانم درێژن": (چەندە پێم خۆش بوو زوبانی حاڵی دەیوت: نالیا/ هەردوو حەیوانین، ئەتۆ گوێ کورت و ئەمنیش گوێ درێژ)[١٤]. بەلآم ئەم بەرگرییە مرۆڤانەیەی نالی لە جەوهەری حەیوانییەت، وەك خاڵی هاوبەشی نێوان گوێدرێژ و مرۆڤ، هەرگیز کارکردێکی گشتی لەناو زمان و کەلتووری پاشتری کوردەکاندا، بەخۆیەوە ناگرێت و نابێتە باو: گوێدرێژ، هەر بە (کەر)ی دەمێنێتەوە. ئەم تێگەیشتنە ڕەگێکی لە ئایینداپە چونکە زمانی ئایینی مرۆڤ وەك

خـــەڵقکراویێك لـــە وێنـــەی خـــوادا پێناســـە دەکـــات، "مـــرۆڤ باشـــترین خەڵقراوێکە"، لەکاتێکدا ئـاژەڵ، ئافەریدەیەکە بـۆ خزمـەتکردنی مـرۆڤ. بەشـــێکی دیکـــەی ئـــەو تێگەیـــشتنەی پێـــشوو، ڕەگەکـــەی ئـــەوەتا لـــەو نەزانیيەدایـە کـە دزە دەکاتـە نـاو ژیـانی کۆمەڵایـەتی بوونـەوەری ئاقـڵ و ژیرەوە. چونکە یـەکێك لـە ڕێگاکـانی شـاردنەوەی نـەزانی، کەمکردنـەوە و سـووکایەتیکردنە بـە پلـەی کەسـایەتی و پێگـەی ئـەوانیتر، لـە ڕێگـەی ناوهێنان و هێنانـەخوارەوەیان بـۆ ئاسـتی ئاژەڵێـك، کـە لـە زمـانی ئێمـەدا پێیـدەگوترێ گوێدرێـژ، یـان کـەر. دانـا ئـەو کەسـەیە، هـەرگیز ڕەفتارێـك نەنوێنێ، یان گوتەیەکی لە زار نەیەتـە دەرەوە، کـە بـواری بـەراوردکردنی ئەو بە کەر دەستەبەر بکات، هەورەکو چۆن نابێت شێتانەش هەڵسوکەوت بکات، چونکە ئەمە هێنانە خوارەوەیە لە پلەی خۆی.

### ٣. تێگەیشتنی جوانیناسانە:

پەیوەستکردنی تێگەیشتنی جوانیناسانە لە زمان، لـەلای میللـەتان و هـۆزە مرۆییـەکان، لـەو پەیوەندیـە تایبەتـەوە هـاتووە کـە دەڵێـت: هـیچ میللـەت و کەلتوورێکی ئەم سـەر زەوییـە نییـە لـە هەسـتی جوانیناسـانە بـەدەر بێـت[١٥]. بۆیـە ڕەفتـار، یـان بـیرورا دەربـڕین و بڕیـار و هەڵوێـست وەرگـرتن لـە کـاتی گونجـاودا، بـە کـاری (عاقڵانـە) و ژیرانـە وەسـف دەکـرێن[١٦]، چـونکە جـوانن، پڕاوپڕ و گونجاون لە شوێن و کـاتی خۆیانـدا. (فـلان قسەیەکی جوانی کـرد)، یان هەڵوێستێکی جوانی هەبوو، واتە عاقڵانە هاتەگۆ و ژیرانە ڕەفتاری نوانـد. لێرەدا ئـەقڵ و ژیـر، وەك چالاکییەکی زەینـی و دەماخییانـەی مـرۆڤ، دەبێتـە وەسفێك بۆ ڕەفتاری جەستەیی تاکەکەس. واتە ئەو کاتەی بەکەسێ دەگوترێ عاقڵ، مەرج نییە لەو وەسفکردنەیدا ڕەهەنـدی بیریانـە و هزریانـەی چالاکیە زەینییەکـــەیمان مەبەســـت بـــێ، هێنـــدەی ئـــەوەی هەڵـــسوکەوت و شـــێوازی ڕەفتاریمان مەبەستە.

ئەگەرچـــی هـــەموو ڕەفتـــار و گوتەیـــەك لـــە شـــێوازێکی تایبـــەتی بیرکردنەوەوە سەرچاوە دەگرێ، چونکە "**هەیبەتی ستایشکراوی مـرۆڤ لـە**

وته و هەڵبـژاردن و جووڵـە و سـەقامگیریدا بـەدیار دەکـەوێ"[١٧]. کەواتـە بەپێی ئەم تێگەیشتنە بێت، ڕەفتار و گوفتار پێکەوە شتێك تەواو دەکـەن، کە دەکرێ بە ***جوان*** پێناسە بکرێت. بەم جۆرەش هەروەك چۆن ئـەقڵ لـە بەکارهێنانی ڕۆژانەی زمـانی کوردیـدا، سیفەتی لاواز وەردەگرێـت، ئـاواش سیفەتی جوان وەردەگرێت. ئەقڵی جوان لـەلای کوردەکـان وەبیرخـەرەوەی ڕەفتاری جوانە و ڕەفتاری جوانیش بەرهەمی بیرکردنەوەی ژیرانـەیە.

**تێگەیشتنی بەهادارانە:**

ئەو شتەی بۆ ئەوانیتر ماقووڵ و قابیلی تێگەیشتن بێت، "عاقڵانەیە" و بەها و نرخی تایبەتی خۆی هەیە. ئەگـەر مـرۆڤ لـە ئاسـت ئەوانـەی لـە خـۆی دەسـتکورتترن، یـان بێدەسـەڵاتترن، یـاخود توندوتیـژترن ڕەفتـار و هەڵوێـــستی پێـــچەوانەی هەڵبـــژارد و لەگەڵیانـــدا ســـەخاوەتمەندانە، سنگفراوان و لێبووردووانە، چووە پێشەوە، بـەهای ڕەفتارەکـەی لـە زمـانی کوردیدا بە "ڕەفتارێکی عاقڵانە و ژیرانە" وەسف دەکرێ. لێـرەدا زاراوەی (عاقڵانـە و ژیرانـە)، بـەها و ستایـشکردنێکە لەلایـەن ئـەوانیترەوە، وەك نـرخێکـی مەعنـەوی بـۆ ڕەفتـار و گوفتـار و هەڵوێـستێك دادەنـرێ، کـە سەرمەشقە بۆ دووبارەکردنەوە و چاولێکردن و بەرز ڕاگرتن.

تێگەیشتنی بەهادارانە لە ئەقڵ و ژیری، بەمانای ئەوەش دێت، کە کەسی ژیر و عاقڵ، لە هەمان کاتیشدا کەسێکی دادپەروەر و لە خوداترس و عاقیبەتناسە و تەنانەت بە ئیمانیشە، چونکە ژیری و ئەقڵ لە دادپەروەری، خوداترسی و ئیمان پتەویی مرۆڤ جیاناکرێتەوە. بەهای ڕەفتاری ئاقڵانە، لەوێوە دێت، کە ڕەفتار یان گوفتاری بکەر سەرپێیانە نەبووە و لە ڕاستگۆییەوە هاتووە.

٤. **تێگەیشتنی سەرزەنشکارانە:**

ئەمە ئەو بەکارهێنانەی چەمکی ئەقڵ و ژیـرە لـە زمـانی ئێمـەدا، کـە بەهۆیەوە ئەوەی دەگوترێ، پێچەوانەکەی مەبەستە. ئەم بەکارهێنانە لەو دۆخانەدایە کە تیایدا کەسێ شتێك دەڵێ و دەکات، یان نیـازی ئەنجامـدانی

هەیە، کە نابێت بگوترێ، یان بکرێ و ئەنجام بدرێ. ئەو کەسە لێرەدا بە (عاقڵ) ناو دەبرێ و زیاتریش جەخت لەسەر گۆکردنی وشەکە دەکرێتەوە، بەجۆرێ مانای ئەوە بگەیەنێ کە بکەر، (ناعاقڵانە) هاتۆتە گۆ و (ناژیرانە) ڕەفتاری نواندووە.

بۆ نموونە: لەکاتێکدا گەورەکان شتێك فێری منداڵان دەکەن، کە منداڵەکان بە لاڕێدا دەبات (چونکە بەپێی پەندی کوردی: "گەورە ئاو دەڕێژێت و بچووك پێی لێ دەخات")، یان گەورەساڵان شتێ دەڵێن، کە ئەنجامەکەی خراپ و ناپەسەندە، یاخود دەیانەوێ شتێ بکەن کە بەرپرسیارییەکی قورسی بەدواوەیە و هتد. لەو بارودۆخانەدا ئەو کەسە بە لۆمەوە، بە ڕیتمێکی دەنگیی تایبەتەوە، بە (عاقڵ) ناو دەبرێ (بە خوا، عاقڵیت) و بەمەش ئەوەی بیردەخرێتەوە کە بێئەقڵانە، یان نائاقڵانە دەپەیڤێ و ڕەفتاری کردووە. لێرەشەوە، سەرزەنشت دەکرێ و ئاگادار دەکرێتەوە لەبارەی ئەوەی دەیڵێ و دەیکات، چونکە قەبووڵ ناکرێ و بۆ ئەقڵ پەسەند نییە و کەس پشتگیریی لێ ناکات و وەك خەسڵەتی مرۆڤی ئاقڵ و ژیر بۆی نانووسرێ.

بەم جۆرە بۆمان ئاشکرا دەبێت، کە لە زمانی کوردیدا وشەی ئاقڵ، عاقڵ یان ئەقڵ و ژیری، لە بارودۆخی جیاوازی ژیانی کۆمەڵایەتی و قۆناغی مێژوویی ناچوونیەکدا، مانای تایبەت و جیاوازی هەیە. هەروەها ئەو وشەیە ڕەگەزمەندە و ئاشکراکەری پێگەی نێر و گەورەساڵانە لە ئاست مێیینە و کەم تەمەن و تەنانەت بێگانە و ئەوانیتریشدا. ئەوە ڕاستە کە ئەقڵ زۆرجار لە زمانی ئێمەدا ئاماژەیە بە چالاکییەکی هۆشەکی و زەینی، بەڵام زۆرجاریش بۆ وەسفکردنی ڕەفتاری تاکەکەس و چالاکییە جەستەییەکان بەکار دەهێنرێت. ئەمەش وایکردووە تاکەکەس لە پێگەی تایبەتی خۆیدا بتوانێ هەمیشە بە هۆی ڕەفتاری تایبەتەوە، یان هەڵسوکەوتی تایبەتمەندەوە ڕاددەی زانایی بیر و هۆشی خۆی بشارێتەوە، یان ئاشکرای بکات.

ئەوەی لە بەکارهێنانی کوردییانە بۆ وشەی عـەقڵ و ژیـر بـە نـەگۆڕی دەمێنێتـەوە، ئەوەیـە کـە ئـەم دوو زاراوەیـە هەمیـشە بەرهەمهێنـەرەوەی زەینییـــەتی (نێرینـــە) و (خۆمانـــە) و (بەتەمەنەکانـــە)، لـــە بەرامبـــەر (منـداڵ) و (بێگانـە) و (مێیینـە)دا. هۆکـاری ئەمـەش ئەوەیـە کـە بکـەری بیرکـەرەوە، کـە لەهـەمان کاتیـشدا دەسـەڵاتی ناولێنـان و ناوسـەندنەوە و بەهابەخــشین، نرخانــدن و سەرزەنــشکردنی شــت و کەســەکانی هەیــە، نێرینەی بەتەمەنە.

هەندێك لەم بەکارهێنانانەی وشەی ئەقڵ، لە زمـانی کوردیـدا، لەگـەڵ ئەو شیکردنەوانەی لە فەرهەنگە فەلسەفییەکاندا بۆ ژیر و ئـەقڵ کـراون، ناکۆك نین، بەڵام گرنگە ئەوە بەبیر بهێنرێتەوە، کـە بـەکارهێنانی وشـەی ژیر و ئـەقڵ لـە زمـانی ڕۆژانـەدا و لـە سـیاقی پەیوەندییـە کۆمەڵایـەتی و نێـوان مرۆییەکانـدا، جیـاوازە لـە بەکارهێنانـە فەلـسەفییەکانی. چـاکترە لەمبارەیـەوە جیاکارەیـەك بکـەین و بـەم جـۆرە بیخەینـە ڕوو: لـە زمـانی ڕۆژانەی کوردیدا باوەڕبوون بە کار و بڕیار و ساتەوەختی ئەقڵانی هەیـە. ئەم بڕوایە لەسەر سـوودمەندی ئـەقڵ لەبەرمبـەر نائەقڵانییـەت و دژ بـە ئەقڵانییـەت، دامـەزراوە، چـونکە ئـەقڵ کـاراتر و باشـترە. کەسـی ئـاقڵ، کەسێکە لە ساتەوەختە هەستیار و ناسکەکاندا، هەلومەرجـەکان بەباشـی دەرك دەکات و بڕیاری پێویست و گونجاویان لەبارەوە دەدات. کەسی ئـاقڵ، لـەکاتی مەترسـیداردا زۆر سـوور نییـە لەسـەر بیروڕاکـانی خـۆی، توانـای خۆشـبوون و بەخـشندەیی هەیـە، کەسـێکی بەویژدانـە و لـە بـارودۆخی تایبەتیشدا ڕێگاچارەی پێویست و پەسەند دەخاتە ڕوو.

لەدرێژەی ئەمەشدا، پێویستە ئاماژە بەو ڕاستیەش بکەین، کـە ئـەم زاراوانـە (ئەقڵ و ژیر و عاقڵانە)، لە ژێرکاریگەریی کەلتووری سەردەستەدا، (کـە لێـرەدا مەبەسـتمان کـەلتووری باوکـسالاری و نێرسـەروەرییە و ئـەم کـەلتوورەش لـە قووڵاییـەکانی مێـژووی ئێمـەدا ڕەگـی خـۆی داکوتـاوە)، بـەپێی بـارودۆخی بەکارهێنانیان لە ژیانی ڕۆژانەدا، دەگۆڕێن. لـە هەنـدێ بارودۆخـدا بـەکارهێنانی

ڕەگەزمەندانــە بەســەر مانــای وشــەی ژیــر و ئەقڵدا زاڵـە، لـە کـاتی تـردا مانـای جوانیناسانە و لە بارودۆخێکی تردا مانای بەهادارانە و لە دۆخی دیکەشدا مانای سەرزەنشکارانە.

بۆیــە هــەموو ئــەم بەکارهێنانــەی وشــەی ژیــر و ئــەقڵ لـەناو زمـانی کوردیــدا، بەتایبــەتی دیــالێکتی ســۆرانیدا، پابەنــدن بــە بەکارهێنانــە ڕۆژانەییەکەیان و لەئاستی زمـانی ڕەمەکیـدا، نـەك پابەنـد بـن بـە زمـانی زانستی و لە ئاستە فەلسەفییەکەیدا. هەر بۆیەشە جیاکردنەوەی ئەم دوو ئاستە لەیەکتر گرنگیی تایبەتی خۆی هەیە و هەر لەوێشەوەیە تێدەگەین، کە چۆنێتی بەکارهێنانی وشە و زاراوەیەك لە زمانێکی تایبەتـدا، بۆخـۆی دەتوانێ ڕێگـر بـێ لەبـەردەم تێگەیـشتنی فەلـسەفییانە لـە هـەمان وشـە و زاراوە. چونکە ئەو زمانەی لە دەربڕین و هزرینی فەلسەفیدا هەژار بێـت، ڕێگـری لەبــەردەم بەرهەمهێنانــەوەی فەلــسەفییانەی وشــە و زاراوەکانــدا دروســتدەکات و ئەمــەش ئــەو شــتەیە کــە پێویــستە توێــژەرانی بــواری فەلسەفە و وەرگێـڕی بەرهەمـە فەلـسەفییەکان، ئاگـاداری بـن. بـۆ نموونـە هــەر یــەك لــە وشــەکانی وەك: (مــن) و (ئێمــە)، (خــودی) و (بابــەتی)، (ئــەویتر)، (بــوون) و (هــەبوو)، (هــیچ)، (گومــان)، (گوتــە)، (گوتــار)، لــە بـەکارهێنانی ڕۆژانـەدا مانایـەکیان هەیـە و لـە دەقـی هـزری و فەلـسەفیدا مانایەکی جیاواز.

**بە کورتی:** وشەی ئەقڵ لە زمانی کوردیدا، وەك وشەی (عقل) لە زمانی عەرەبی و وشەی (عقل و خرد) لە زمانی فارسیدا، وشەیەکی ستاندارد و هەمەگیر نییە و زۆر وشەی دیکەی وەك (ژیر، زانا، دانا، هۆشمەند، عال، فامیدە) و هتد، لەکاتی جیاواز و بۆنەی جیاوازدا هەمان مانای وشەی ئەقڵ و ژیر دەگەیەنن. بۆیە لەم باسەدا و ناوبەناو، وێڕای بەکارهێنانی هەریەك لە وشەکانی وەك: ئەقڵ و عەقڵ، وشەی (ژیر) و (ژیری)یش بەکار دەهێنرێ، هەروەك چۆن لە جیاتی عەقڵانییەت و ڕاشیۆنالیزم، ژیرباوەڕی و

ژیرپەسەندیش بەکار دەهێنین، ئەمەش وەك پێشنیارێك و ڕێگەخۆشکەرێ بۆ بەکارهێنانی فەلسەفییانەی ئەم وشەیە لە زمانەکەدا.

ئەوەی دەمێنێتەوە لێرەدا بە کورتی ئاماژەی پێبدەین ئەم پرسیارەیە: ئایا تا چەندە منی بیرکەرەوەی دیکارتی، دەتوانێ لە چوارچێوەی منی بیرکەرەوەی ناو زمانی کوردیدا بەرجەستە ببێت، کە منێکە بیرکردنەوەکەی لەلایەن کەلتوور و ڕەگەزەکەیەوە، سنووردار کراوە. ئایا سەبجەکتی کوردی لە بنەمادا دەتوانێ لەدەرەوەی ئەو سنوورە کەلتوورییە و ئەو سنوورە ڕەگەزمەندە نێرانەیەوە، بەئازادی بیر بکاتەوە؟

## باسی دووەم

### ئەقڵ و ژیری لە بەکارهێنانە فەلسەفییەکانیدا:

**یەکەم: ماناکانی زارەوەی ئەقڵ:**

لێرە بەدواوە، ئەو تێڕوانینە ئەنترۆپۆلۆژیانەیە بۆ بەکارهێنانی زمان و (لە پێناوی) دەستنیشانکردنی ماناکانی وشەی ئەقڵ، لە بەکارهێنانی ڕۆژانەی زمانی کوردیدا، بەجێدەهێڵین و دەپەڕینەوە بۆ ناو مێژووی فەلسەفە. ئەمەش بەمەبەستی ناسینەوەی مانا گشتییەکانی چەمکی ئەقڵ، یان ژیر، لەلای هەندێ لە فەیلەسووف و ڕێبازە فەلسەفییەکان. بەڵام ئەوە بەبیر دەهێنینەوە، کە جیاوازی ناولێنانەکان و ماناکانی ئەقڵ و ژیری، لە زمانە جیاوازەکاندا، نەبۆتە ڕێگر لەبەردەم ئەو مانایانەی فەیلەسووفەکان لەم زاراوەیە هەڵیانهێنجاوە و بەدرێژایی مێژووی فەلسەفە مشتومڕیان لەبارەوە کردوون.

بەشێوەیەکی گشتی، لە فەلسەفەی کۆن و نوێی خۆرئاواییدا، بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە بە چەندین مانای جیاواز هاتووە، کە ئێمە لێرەدا ئاماژە بە چوار مانا و جۆری بەکارهێنانی باو دەکەین. دەبێ ئەوەش بگوترێ کە هەندێ لەم مانایانە پەڕیونەتەوە ناو هزری

فەیلەسووفە موسوڵمانەکانی وەك فارابی، کندی، ئیبن ئەلڕوشد و کەسانی تریش[١٨]، کە لێرەدا بواری باسکردنیمان نییە:

١- **ئەقڵی گەردوونی یان (ژیریی میتافیزیکی):** بریتییە لەو پرانسیپ و بنەڕەتە گەردوونییەی کە واقعیەت دەبەخشێتە گەردوون، یان مانا بەجیهان دەبەخشێ و بونیادی ئاسایش و ڕێکخستنی بۆ دەستەبەر دەکا. بەپێی ئەم تێگەیشتنە لە ئەقڵ، گەردوون بەپێی پرانسیپ و مەبدەئێکی بابەتییانە، کە لۆگۆسە (Logos)، بەڕێوە دەچێت و لەبەر ئەوەش کە هەمان پرانسیپ لە مرۆڤیشدا هەیە، ئەوە مرۆڤ دەتوانێت بگات بە ئاستێك لە تێگەیشتنی مەعریفی لەسەر جیهان.

کانت ڕەخنە لەم عەقڵە میتافیزیکییە دەگرێت و پێیوایە ئەو دیدگایە: ئەقڵ لە ژیانی مرۆڤایەتی دابڕ دەکات و چوارچێوەیەکی سەربەخۆ و دەرە سروشتی، یان میتافیزیکییانەی پێدەبەخشێت، کە لە بنەمادا نییەتی. چونکە بەلای ئەم فەیلەسووفەوە **"ئێمە ناتوانین جیهان وەك ئەوەی کە هەیە، واتە سەربەخۆ لە ڕوانگەی بکەری ناسکەر، دەرك بکەین"** و **"وێناکردنی ئایدیای ئەقڵ، سەرچاوەی گشت وەهمە میتافیزیکییەکان لەخۆی دەگرێت"**[١٩]. بەم مانایەش **"ئەقڵ بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدایە، وەك لایب نیتس گوتبووی: لە نابیناییەوە تەماشای جیهان بکات"**[٢٠].

لەلای ئایدیالیستەکانی ئەڵمانیا، لەوانەش هیگڵ، بەرپەرچی کانت دەدرێتەوە. هیگڵ لای وایە بەشێ لە ژیری گەردوونی (ڕۆحی جیهان) لە میانەی ڕەوتی مێژوودا گەشە دەکات و ئامانجی کۆتایی مێژووش بریتییە لە گەشەپێدان بە عەقڵی مرۆڤ. بەم جۆرەش مرۆڤ بۆی ڕوون دەبێتەوە کە عەقڵی تاکەکەسیانەی ئەو، بەشێکە لە عەقڵی بابەتیانەی گەردوونی. لێرەوە هیگڵ دەڵێت ڕۆح لە ڕێگەی عەقڵی مرۆڤەوە لە خۆی بەئاگا دێتەوە و دەگاتە پلەی هۆشیاری، چونکە ئەم ئاگاییە لەهەمان کاتدا، خودئاگاییە[٢١].

٢- **ئەقڵی تیۆری**: بەشێوەیەکی گشتی و لە ڕەوتی مێژووی هزری ئەوروپیدا، عەقڵی تیۆری بە توانایییەکی زانیارەکی لەلای مرۆڤ، دەدرێتە قەڵەم کە بنەما پێشینی و زگماکەکانی مەعریفەی تێدایە[٢٢]. واتە تواناییەك کە شوناس دەکات و مەعریفە لەسەر جیهان زەخیرە دەخات و زانیاری مرۆڤ بە ژیان، زیاد دەکات.

بەلای زۆربەی فەیلەسووفەکانەوە، ئەقڵی تیۆری (ساتەوەختێکە، یان ئانێکە) لە ئەقڵی گەردوونی. لێرەوە مانای وشەکە دەبێتە: **"ئەو تواناییەی ئەقڵ، کە مەعریفەیەکی سەلمێنراومان لەسەر شتەکان دەداتێ، کە ناکۆکە لەگەڵ باوەڕهێنان. هەر بیروڕایەك ئەو کاتە عەقڵانییە، کە خاوەن بیروڕاکە بتوانێ ئەو بەڵگانەی لە دژی بیروڕاکانین بخاتە ڕوو، ئامادەش بێ لە سێبەری ئەو گفتوگۆ و بەڵگانەی لە دژی دەخرێنە ڕوو، بەرگریی لە خۆی بکات و سەرلەنوێ بیروڕاکانی خۆی هەڵبسەنگێنێتەوە"**[٢٣]. بەمانایەکی تر، عەقڵی تیۆری، عەقڵێکی خۆبین و ڕیفلیکسیڤە و توانای بە باتەکردنی خۆی هەیە تاکو خۆی لەو هەڵە و کەموکوڕیانە بپارێزێ کە تێیان کەوتووە، یان بۆی هەیە تێیان بکەوێت.

٣. **عەقڵی پراکتیکی**: بەو تواناییە دەگوترێ کە لەلایەن مرۆڤەوە بەکار دەهێنرێت بۆ ڕابەرایەتیکردن و بڕیاردان لەسەر ئیرادە. بۆیە ئەرکی عەقڵی پراکتیکی ئەوەیە بەدوای **"ڕێکخستنێکی ژیانی پراکتیکییانەی مرۆڤدا عەودالْ بێت و ئەو یاسا ئەخلاقییە گشتییانە دابڕێژێ کە بۆ ژیانی ڕۆژانەمان پێویستیمان پێیانە"**[٢٤] بە مانایەکی تر: **"عەقڵی پراکتیکی بریتییە لە توانای بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی ئیش و کارەکان لەسەر بنەمای ژیرەوە."**[٢٥]

لەبەر ئەوەی ژیانی پراکتیکی و ئیرادەمەندانەی مرۆڤ، پێویستی بە ڕێکخستن و تەگبیری ورد و بەڵگەدار هەیە، لەبەر ئەوەی هەستەوەری و مەیل و ئارەزووەکان سەرچاوەی گەیشتن بە مەعریفەی ڕاستەقینە نین،

ئەوە دەتوانین بڵێین: کردەی ژیرانە لە ژیانی پراکتیکی و ڕۆژانەی مرۆڤدا پابەندە بە هزر و بیرکردنەوەی عەقڵانییانەوە.

٤- **عـەقڵی ئامرازگـەرا:** ئـەم چـەمکە لـە لایـەن ئەنـدامانی قوتابخانـەی فرانکفۆرتەوە داهێنراوە و هەریـەك لـە (هۆرکهایمـەر، ئـادۆرنۆ) بـەکاریان هێنـاوە و پاشـتر هابرمـاس لـەوانی خواسـتووە و پـەرەی پێـداوە[٢٦].

بەشێوەیەکی گشتی مەبەستیان لە عـەقڵی ئامرازگـەرا، ئـەو ئەقڵەیـە کـە بـەبێ هـیچ مـەرجێ، جیهـان لەبـەردەم داگیرکـاری و دەستبەسـەراگرتنی تەکنۆلۆژیـدا وەك (بابـەت)ێـك دەبینـێ و هـیچ جـۆرە حورمـەتێکی بـۆ سـەربەخۆیی و یاسـاکانی سروشـت و جیهـان نییـە. ئەمـەش بـەهۆی نەخشەیەکەوە، کە تیایدا (ئامانج و ئامرازەکانی) ئەو دەستبەسـەراگرتنە، دەستنیـشان کـراون و ئـیتر گـوێ بـەهیچ شـتێکی تـر نـادرێ جگـە لـەوەی بەهۆی ئەو ئامرازانەوە بگەینە ئەو "بابەتانە"ی وەك "ئامـانج" لەلایـەن خاوەندارانی تەکنەلۆژیا و سەرمایەوە، دەستنیشان کراون.

لێرەوە، فرانکفۆرتیەکانی وەك ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەر پێیانوایە، "**فەلسەفە دەبێتە ڕەخنە لە ئەقڵی ئامرازگەرا**"، واتە ڕەخنە لە ئەقڵێکی کۆنترۆڵکەر و دەستڕۆیشتوو بەسەر مۆدێرنیتەدا، کە تیایدا "**ئەقڵ لەگەڵ شتەکان، وەکو دیکتاتۆر لەگەڵ مرۆڤەکان ڕەفتار دەکات**"[٢٧].

بـە گوتـەی (هابرمـاس)، خولیـای سـەرەکی و مەبەسـتی بنـەمایی عـەقڵی ئامرازگەرا ئەوەیە (واقیع) داگیر بکـات و هـەر لەبـەر ئەمـەش نـاوبراو بـە پەسـەندی نازانێـت ئـەم جـۆرە ئەقڵـە ببێتـە بناغـەی زانـستە کۆمەڵایەتییەکان، چونکە عەقڵێکـە لـە خزمـەت ئامرازەکاندایـە، نـەك لـە خزمـەتی ئـەو ئامانجـە مەعریفیانـەی کـە هـەوڵی باشـترکردنی کۆمـەڵگا دەدەن[٢٨].

**دووەم: ژیرباوەڕی، یان ئەقڵانییەت:**

ئێستا پاش ئەوەی چوار مانای باوی وشەی عەقڵ و ژیری، لە نەریتی هزر و فەلسەفەی ئەوروپیدا دەستنیشان کران، دەمانەوێ بزانین ئاراستە

و دۆکترینی عەقڵانییەت، کە ڕێچکەیەکی ناو هەمان مێژووی فەلسەفییە، بنەما و پرانسیپەکانی چین. ئەمەش لەبەر ئەوەی دیکارت بۆخۆی سەر بەو ڕێبازەیە و ناسینی ڕێبازەکەی هەنگاوێکی ترە بۆ نزیکبوونەوە و پەیبردن بە کرۆك و جەوهەری فەلسەفەکەی.

لە فەلسەفەدا، ژیرباوەڕی، یان ژیرپەسەندی، بەو نەرێتەی مەعریفەی تیۆری دەگوترێ، کە بە پێچەوانەی ئەزموونگەراکانەوە، بڕوای وایە: **"پەسەندترین سەرچاوە و هەڵسەنگێنەری ناسین و مەعریفە، ژیر و عەقڵە"**[29]، هەروەها بەپێی ئەم ئاراستەیە، شیاوە تەنیا بەهۆی بەکارهێنانی عەقڵەوە، داوەری لەبارەی واقیعەوە بکرێ، ئەمەش لەبەر ئەو بڕوا و متمانە پتەوەی پەیڕەوکارانی ئەم ڕەوتە فەلسەفییە بە ژیر و ئەقڵ، لە توانایدا بۆ ناسین و دەرککردنی واقیع، هەیانە. لەلایەکی ترەوە، ژیرباوەڕی بریتییە **"لەو جۆرە تێگەشتنەی کە داوا دەکات ڕێچکە ئایینییەکان بەشێوەیەکی ژیرانە و عەقڵانی بسەلمێنرێن و لێرەشەوە بەرپەرچی هەر باوەڕێك دەداتەوە کە لە دەرەوەی توانای تێگەشتنی مرۆڤدا بێت"**[30] خەسڵەتی هەرە سەرەکی ژیرباوەڕەکان ئەوەیە، لە **"بەدەستهێنانی زانست و مەعریفەدا ڕۆڵی سەرەکی دەدەنە ئەقڵ و، ژیر دەکەنە پێوەر بۆ گەیشتن بە ڕاستی، نەك هەستەکان و ئەزمونکردن"**[31] ڕیشەی مێژوویی ژیرباوەڕی دەگەڕێتەوە بۆ فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان و دەکرێت، وەکو کانت گوتوویەتی: (ئەفلاتوون)ی مەزنە فەیلەسووفیش بە **"سەرکردەی ژیرباوەڕان"** دابنرێت[32]. هەڵوێستی ئاشکرای ئەفلاتوون لە ئاست ڕەتکردنەوەی هەستەکاندا و جەختکردنەوەی لەسەر مەعریفەی عەقڵانی، ڕێگە دەدات ئەو پێگەیە بۆ ئەفلاتوون لەپێش چاو بگیرێ. چونکە ئەو لەو باوەڕەدا بوو **"ژیر دەتوانێ کۆی ئەو شتانەی دەتوانین لەسەر جیهان و ئاکار بیانزانین، بۆ ئێمە ئاشکرا بکات"**[33].

ئەفلاتوون لە کتێبی **کۆماردا**، کاتێ پێکهاتەی ڕۆحیی مرۆڤ بەسەر سێ بەشدا دابەش دەکات، ژیر دەکاتە پێوەر و کۆنترۆڵکەری ڕەهەندی مەیل و

ڕەهەندی تووڕەیی[٣٤]. بەلای ئەفلاتوونەوە، **"ئەقڵ وەك ئامرازێك وایە کە بە هۆیەوە مرۆڤ بە مەعریفەی ڕاستەقینە، واتە بە وێنە نەگۆڕەکان، یان بە چییەتی شتەکان دەگات"**[٣٥]..

بەم جۆرەش یەکەمین کارێ لەبواری مەعریفەتناسیدا، ئەفلاتوون کردی، بریتی بوو لە دروستکردنی جیاکارییەك لە نێوان (زانست) و (باوەڕ)دا. ئەو دەیگوت: **"زانست پەیوەندیی هەیە بە حەقیقەتەوە، ئەگەر کەسێ بڵێ: (من شتێ دەزانم)، ئەوە ئەو شتە (حەقیقەتی) هەیە. وەلێ بۆی هەیە باوەڕ درۆزنانە و هەڵە بێت. تەنانەت باوەڕێکی ڕاستەقینەش بە پێویست نابێتە مەعریفە. چونکە مەعریفە هەر بەوە نایەتە دەست کە ئێمە خاوەنی باوەڕێکی ڕاست بین، بەڵکو پێویستە تواناشمان هەبێ بەهۆی بەڵگەی ئەقڵانییانەوە بیسەلمێنین"**[٣٦]. باوەڕی ئەفلاتوون بە ژیری و بەڵگەی ئەقڵانی گەیشتبووە ئەو شوێنەی کە لەسەر زاری سوکراتەوە، بە ڕاشکاوی پرسیار بکات و بڵێت: **"ئایا داوەری و بڕیاردانی ڕاستەقینە بەهۆی گفتوگۆ و بەڵگەی ئەقڵانییەوە بەدەست نایەت؟"** پاشان هەر سوکرات وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: **"بەڵگەی ژیرانە بنەماییترین ئامرازی مرۆڤی زانا و زانستخوازە"**[٣٧].

فەیلەسووف و زانایانی سەدەی حەڤدەیەم، لە ژێر کاریگەریی شۆڕشی زانستیدا، بڕوایان بەو ژیرپەسەندییە هەبوو، کە لەسەر میتۆدە شیکارییەکانی ماتماتیك و زانست بڕۆیشتبا و لە هەموو جیهاندا شیاوەکی کردەیی و بەکارهێنانی هەبوایە. بەلای ئەوانەوە، **"مەعریفە شتێکە بە ڕوونی و بەهۆی زەیینەوە دەرك دەکرێ، یان بەهۆی بەکارهێنانی ماتماتیکەوە شیاوی پێوان و بەهۆی ئەزموونکردنیشەوە شیاوی سەلماندنە. کاتێك گالیلۆ دەیگوت: بەبێ ماتماتیك ناکرێ تەنانەت یەك وشەش لە کتێبی گەورەی کائینات حاڵی بین، مەبەستی هەمان شت بوو"**[٣٨].

بەلای ئەقڵباوەڕان و کەسایەتییە ڕابەرەکانی ئەو سەردەمەوە (سەدەی حەڤدەیەم)، زانست لەسەر بنەمای توانا عەقڵانییەکانەوە بینا دەکرێت. بێگومان هەموو توانایەکی عەقڵانی نا، تەنیا ئەوانەیان کە دەکارن پێویستی و زەروورەتی یاسا ماتماتیکییەکان شوناس بکەن. بەپێی ئەم لێکدانەوەیە، **"مرۆڤ لە وێنەی یەزداندا دروست کراوە و لێرەشەوە بەشێ لە ئەقڵی خودایی لە مرۆڤدا ئامادەیە. هەر ئەم بەشەیش لە ئەقڵی خودایی یارمەتیدەرمانە لە خوێندنەوەی کتێبی گەورەی ژیاندا، کە دەشێ پێی بگوترێ: بنەما گشتییەکانی چۆنێتی خەڵقکردنی گەردوون"**[٣٩].

بەهەرحاڵ، ئەقڵ نیشانەی توانای بیرکردنەوەیە لەلای مرۆڤ. مرۆڤەکان لە بیرکردنەوەدا ئەوەندە کارامەن، کە هەروەك پێشتر لە زاری سوکراتی ئەفلاتوونەوە بیستمان، دەتوانن، ئەگەر بیانەوێ، زۆرینەی کێشە زانستی و پراکتیکییەکانی خۆیان چارەسەر بکەن و لەسەر بنەما و پەیڕەوێکی ژیرانە، ژیانی خۆیان ڕێکبخەن. **"مرۆڤ بە سروشتی خۆی ئەو توانایەی هەیە بتوانێ بەهۆی عەقڵەوە مشتومڕ لەسەر شتی زۆر ئاڵۆز بکەن و کاریگەریی بکەنە سەر بیروڕای یەکتر. دەتوانن لە بەڵگەکانی ماتماتیك و تیۆرە زانستییەکان تێبگەن و بەرنامە بۆ داهاتووی خۆیان دابڕێژن"**[٤٠].

لەپشت هەموو ئەم شێوازانەی بیرکردنەوەوە، باوەڕێکی پتەو و متمانەیەکی تەواو بە ئەقڵ و ژیرباوەڕی، ئامادەیە، واتە بڕوا بە توانای ئەقڵ لە گەیشتنی بە ڕاستیی هەر شتێك و پەردە هەڵدانەوەی لەسەر ڕاز و نهێنییەکانی هەر بابەتێکی زانستی، ئایینی، ئەخلاقی و هەرشتێکی دی کە شایانی زانین و ناسین بێت.. یەکێك لەو فەیلەسووفانەی لە چوارچێوەی ئەم ئاراستە فەلسەفییەدا بیری دەکردەوە و پاشتر لە مێژووی فەلسەفەدا وەك ڕەوتێکی تایبەت ناسرا، فەیلەسووفی فەرانسەیی: ڕێنێیە دیکارت بوو.

## بەشی دووەم
## ڕێنێیە دیکارت (Descartes) : (١٥٩٦-١٦٥٠):

**کورتەی ژیان و هەڵسەنگاندنێك:**

ئێمە لەم بەشەدا نامانەوێ مێژووی ژیانی دیکارت بە پێی میتۆدی مێژووگەرایی، بنووسینەوە. ئەو میتۆدەی ئێمە کاری پێدەکەین، (وەك لە سەرەتاوە گوتوومانە)، میتۆدێکی **شیکاریی ڕەخنەییە** و تیایدا ڕەچاوی قۆناغی گەشەی مێژوویی ژیانی دیکارت ناکەین، هێندەی ئەوەی دەمانەوێ قسە لەسەر ئەو وێستگە گرنگانەی ژیانی بکەین، کە بۆ فەلسەفەکەی بایەخدارن و یارمەتیمان دەدەن لە شیکردنەوەی بیرۆکە و ناوەڕۆکی فەلسەفییانەی بەرهەمەکانی ئەم فەیلەسووفەدا..

مێژووی هزر بەشێوەیەکی گشتی و هزری فەلسەفی بەشێوەیەکی تایبەتی، لە ئەوروپا و خۆرهەڵاتدا، بێ کێشە نەبووە و زۆرن ئەو فەیلەسووف و بیرمەندانەی ڕقی دەزگا ئایینییەکان و دەسەڵاتیان لەخۆیان هەستاندووە و بەر شاڵاو و پەلاماردان کەوتوون. چیرۆکی ئەوانەی بەر ئەو شاڵاوە کەوتوون و پاشان هەم ستایش کراون و هەم بوونەتە شوێن شانازی کۆمەڵگای خۆیان و مرۆڤایەتی، چیرۆکێکی دووروودرێژە..

دیکارت نموونەی ئەو فەیلەسووف و ئەکادیمیانەیە کە بەر ئەو شاڵاوە کەوتووە. ئەو ڕۆژگارێك ناچاربوو وڵاتەکەی خۆی بەجێبهێڵێت و زۆریش کۆنترۆڵ دەکرا و ڕۆژگارێکیش یاساخ بوو لە زانکۆدا ناوی بهێنرێ. ئەوەی لە دیکارتدا بەپلەی یەکەم سەرنج ڕادەکێشێ، ئەو هەدادان و دان بەخۆداگرتنە زۆرەیەتی، کە لە ژیانیدا بۆ خۆگری و بەرپەرچدانەوەی نەیارەکانی، خستیە کار. باشترین بەڵگە لەسەر ئەم قسەیە و سەلماندنی هەدادان و وردی و دانبەخۆداگرتنی دیکارت، لە ئاست بۆچوون و ڕەخنەی ڕەخنەگران و نەیارەکانیدا، ئەو وەڵامانەیەتی کە لە بەرپەرچدانەوەی

ڕەخنەکانـدا نووسـیویەتی و ئەمـەش بۆتـە بابـەتی شـاکارە گرنگەکـەی بـەناوی **(ناڕەزایەتییـەکان و وەڵامـەکان)**[٤١]، کـە لەچـەند شـوێنێکی ئـەم لێکۆڵینەوەیـەدا بۆتـە سەرچـاوەیەکی گـرنگ و دەسـتی یەکـەمی باسەکەمان[٤٢].

لێرەشـەوە، دیکـارت مرۆڤێکـی زۆر سـەرنجڕاکێش و فەیلەسـووفێکی تایبەتمەندە. یەکێ لەو خەسڵەتانەی لە بیرکردنەوەی ئـەو فەیلەسووفەدا ستایش دەکرێ، بریتییە لە سنگفراوانی و لێبـووردەیی و پەیوەسـتکردنی ئەمانە بە ژیانی ڕۆژانـە و فەلسەفەکەیەوە. دیکارت "نەیدەفەلسەفاند"، بـەڵکو "فەلـسەفەکەی خـۆی دەژیـا" و ئەمـەش خـاڵی هاوبەشـی نێـوان دیکـارت و هـەموو حەکیمـە گەورەکانـە، کـە بڕوایـان وایـە "فەلـسەفە شـێوازێکی ژیانکردنـە" بەرلـەوەی هـەر شـتێکی دیکە بێت. ڕاسـتە ئێمـە سەبارەت بـە بارودۆخـە ڕۆحییـەکانی ئـەو، شـتێکی ئـەوتۆ نـازانین، بـەڵام دەزانـین کـە دیکـارت لـە سـەردەمێکی پـڕ ئاشـووب و پەشـۆکان و گرژیـدا: "**خوازیاری ئاشتی و تەبایی بوو نەك شـەڕ و ململانـێ**"[٤٣]. کاتـێ دیکـارت لە سەرەتای **(*گوتاری دروست بەکارهێنانی ئەقڵ*)**دا[٤٤]، دەنووسێ:

"**لـەنێوان مرۆڤەکانـدا ئـەقڵ لـە هـەر شـتێ باشـتر دابـەش کـراوە**"[٤٥]، ڕێنماییمـان دەکـات بـۆ ئـەوەی عـەقڵی خۆمـان بەشـێوەیەکی دروسـت و ڕاستەقینە بخەینە کار و بەهیچ شێوەیەك مەبەستی ئەوە نییە بڵێ: ئـەو وەکـو فەیلەسـووفێك لـە هـەمووان دانـاتر و ژیرتـرە، بـەڵکو ڕاسـتەوخۆ بەدوای ئەوەدا دەنووسێ:

> "**مـن بـەش بـەحاڵی خـۆم هـیچ کاتێـك بـە خەیاڵمـدا نـەهاتووە نەفـسی مـن لـە بارێکـەوە، لـە هـی زۆربـەی خەڵکی تر تەواوتر بێت، ڕاستە من زۆرجار بە ئاواتەوە بـووم وەك کەسـانی تـر توانـای بیرکردنـەوەی خێـرا و دەستوبرد، خەیاڵی ڕوون و ڕەوان، یادێکی سەرتاپاگیر و هەمیشە بەردەستم هەبێ. من هـیچ جـۆرە سـیفەتێکی**

**تر، کە ببنە مایەی کامڵی و تەواوەتی نەفس، لەوانە بەولاوە شك نابەم.."[46]**

لەم قسانەدا شەففافیەتی هێزی فەلسەفی مۆدێرن و خواستی پەیوەندخوازانەی (Communicative) ئەم فەلسەفەیە بۆ بەشداریکردن لە ڕوونکردنەوەی بارودۆخەکانی مرۆڤ و دۆزینەوەی چارەسازی ئەقڵانی، بەدی دەکرێن. **"دیکارت پیاوێ بوو بەهرەو توانای فەلسەفەی نوێی دۆزییەوە و بیروڕایەکانی لە بواری فیزیا و سروشتناسی و ئەستێرەناسیدا، کاریگەریی زۆریان دروستکرد"[47]**. هەر لێرەشەوەیە کەسانێك دیکارت بە دامەزرێنەری بنچینەی فەلسەفەی مۆدێرن دادەنێن[48] و دیکارتیش لە لووتکەی بیرکردنەوە فەلسەفییەکانی خۆیدا، کاتێ دەیەوێ ڕێگای ڕاستەقینەی بەکارهێنانی عەقڵ ڕوون بکاتەوە، بەو پەڕی خاکەڕاییەوە دێتە گۆ و خۆی لە ڕیزی خەڵکی ڕەمەکیدا دەبینێ و بگرە خۆزگە بە زەینڕوونی و خەیاڵ تۆکمەییان دەخوازێ. ئەو، لە سنگفراوانیی فیکری و لە بڕوای تەواوی بە پەیوەندیی لێکنەپساوی فەلسەفە و ژیانی ئاسایی، بەردەوام دەبێ و دەنووسێ:

> **"من نیازم نییە خەڵك فێری ئەو پەیڕەوە بکەم کە یارمەتییان دەدات بە ڕاست و دروستی مێشکیان بەکار بهێنن، بەڵکو تەنیا دەمەوێ نیشانی بدەم، چۆن من هەوڵم داوە مێشکم بەکاربهێنم، ئەو کەسەی بیەوێ ئامۆژگاری بکات دەبێ لەوانە زیرەکتر بێ کە ئامۆژگارییەکەیان دەکات ئەگەر بچووکترین هەڵەشی کرد ئەوا شایستەی گازندە و سەرزەنشت دەبێت. لەبەر ئەوەی من دەمەوێ ئەم نووسینە وەك ڕاپۆرتێك یاخود ـ ئەگەر بتەوێ بڵێی - وەك چیرۆکێك بیخەمە بەردەست، دوور نییە چەند نموونەیەکی ئەوتۆی تیادابێ شایانی چاولێکردن بن و شتی تریش کە مرۆڤ**

**دەتوانێ پەیڕەویان نەکات، هەرچۆنێك بێت من بەو هیوایەم زیانی کەسی لێ نەکەوێتەوە و سوپاسی هەریەکێك دەکەم کە بەو ڕاشکاوییەی من بزانێت"**[٤٩].

ڕەهەندی لێبووردەیی و سنگفراوانی و ڕاستگۆیی لەم دەقەدا لەهەر ڕەهەندێکی دیکەی بەرجەستەترە و نووسەری ئەم قسانەش خاوەنی کەسایەتییەکی سادە و ئاسانگیر و خۆش مەشرەب بووە، کە خۆی لە کەس بە عاقڵتر نەزانیوە. ئەمەش نموونەی[٥٠] ژیان و هزری هەر فەیلەسووفێکی ڕاستگۆیە کە شایانی ستایش و چاولێکردن و لێتێگەیشتنە.

مێشکی دیکارت، وەك بەرتراند راسڵ گوتوویەتی: "**تەنیا لە ژینگەی گەرمدا کاری دەکرد"**[٥١]. تەمەنی جەستەیی دیکارت زۆر کورتتر بوو لە تەمەنی فەلسەفی و هزریی ئەو. لە ژیانی کۆمەڵایەتی دیکارتدا، هیچ سەرسامییەکی ئەوتۆ نابینرێتەوە: "**هەرگیز هاوسەری نەگرتووە، بەڵام کچێکی لەدەرەوەی هاوسەرگیری هەبووە، کە لە تەمەنی پێنج ساڵاندا کۆچی دوایی دەکات و ئەمەش دەبێتە گەورەترین خەمی ناو ژیانی دیکارت. ئەو کەمی خوێندۆتەوە، کەمی نووسیوە و زۆریش خۆی ماندوو نەکردووە"**[٥٢]، کەچی فەلسەفەکەی، هەم کاریگەرییەکی زۆری کردە سەر ڕەوتی بیرکردنەوەی پاش خۆی و هەم سەرلەبەری ئاراستە فەلسەفییەکانی دوای خۆی سەرسام کرد.

دیکارت ئەو فەیلەسووفە بوو کە لە عەودالیی وەڵامدانەوەی پرسیارە فەلسەفییەکانی شاژنی سویدی، (کریستینا)دا، فەرەنسای بەجێهێشت و ڕووی کردە باکووری ئەوروپا تاکو لە تێگەیاندنی فەلسەفەکەیدا یارمەتی شاژن بدات[٥٣]. باکووری ئەوروپا ساردە و شاژنیش ویستوویەتی دیکارت هەموو ڕۆژێ لە کاتژمێر پێنجی بەیانیاندا وانەی پێبڵێتەوە، چونکە شاژن "**لەو کاتەدا زەینی پتر لەکارا بووە"**[٥٤]. لەگەڵ ئەوەشدا کە دیکارت بەهۆی لاوازیی جەستەیەوە زۆر ئاگای لەخۆی بووە، بەڵام سەرمای

ئەسـکەندەناڤیا کـاری خـۆی دەکـات و دیکـارت بەرگـەی هـەواگۆڕکێ و سـەرمای ئـەو مەڵبەنـدە ناگرێـت و لـە سـاڵی ١٦٥٠دا، کۆتـایی بـە ژیـانی دێت[٥٥].

وەك پێـشتر ئامـاژەی پێـدرا، دیکـارت بـە دامەزرێنـەری بنـەماکانی فەلـسەفەی نـوێ دادەنرێـت و هەنـدێکیش بـە **"بـاوکی ڕاسـتەقینەی فەلسەفەی نوێ"**یان لەقەڵەمداوە[٥٦]، ئەگەرچی ئەم ناونانـە سـەبارەت بـە پـەیامی باوککوژانـەی مۆدێرنیتـە وردەکاری تێدا نییـە، بـەڵام دیکارت چ وەك دامەزرێنەر، یان "باوك"ی فەلسەفەی نوێ، ناوزەد بکرێ، نابێت ئـەم قسەیە وەها لێکبدرێتەوە، کە هـەتا سـەردەمی دیکارت، فەلـسەفە ***گۆڕانی*** بەسەردا نەهاتووە و شتی نـوێی نەچۆتە سـەر. بـەو پێیـەی فەلـسەفە بـە هەسـتیارییەکی قووڵـەوە لـە ژیـان و مـرۆڤ دەکۆڵێتـەوەو ئەمانـەش بابەتگەلێکی سەقامگرتوو نین و هـەردەم لـە گۆڕانـدان، ئـەوە فەلـسەفەش بەردەوام قسەی لەسەر گۆڕاوەکان کردووە و خۆی نوێ کردۆتـەوە. ئـەوەی دیکـارت دەکاتــە دامەزرێنــەری فەلــسەفەی نــوێ، وەك بەرترانــد راســڵ دەنووسێ، ئەوەیە کە: **"دیکارت هەم خاوەن توانایەکی فەلسەفیی بەرزە و هـەم جیهانبینییەکەیـشی بـە قـووڵی لـەژێر کاریگـەریی فیزیـك و ئەستێرەناسـی نوێدایـە"**. ڕاسـتە دیکـارت بەشـێکی زۆر لـە فەلـسەفەی سکۆلاستیکیی سـەدەکانی ناوەڕاست، لـە هـزری خۆیـدا گلدەداتـەوە، بـەڵام **"ئـەو بناخەیـە پەسـەند ناکـات کـە پێـشینەکانی دایانڕشـتبوو، بـەڵکو دەیویـست بناخەیـەکی فەلـسەفیی نـوێ دروسـتبکات"**[٥٧]. وێـڕای ئـەم دەستنیشانکردنە گرنگەی راسڵ، دەتوانین لە پشت گرنگیـی دیکارتـەوە بـۆ فەلسەفەی نوێ، سێ هۆکاری دیکەش بەبیر بهێنینەوە:

**یەکەم:** دیکـارت زمـانێکی فەلـسەفی شـەفافی هـەبووە و شـارەزای هونـەری دەربڕین بووە و دیارە چەشەیەکی بەرزی ئەدەبیـشی هـەبووە: **"دەگـوترێ دیکـارت یەکـەم فەیلەسـووفە نموونەیـەکی تـەواوی پەخـشانی فەرەنـسی پێـشکەش کردبـێ و .. هـەوڵێکی زۆریـشی داوە بـۆ پێناسـەکردن و**

**سنووربەندکردنی زاراوەکانی"**[٥٨]. ئەمەش بەتایبەتی لە هەردوو کتێبی (ڕامانەکان) و (***گوتاری بەکارهێنانی دروستی ئەقڵ)***، دەگاتە ئەو پەڕی جوانی و شیعرییەت: "**ئەو نرخێکی زۆر بۆ خۆشخوانی و شیعرییەت دادەنا، وەلێ بڕوای وابوو ئەوە تواناییەکی سروشتین پتر لەوەی زمانی توێژینەوە بن"**[٥٩].

وەك توێژەرانی بواری هزری دیکارت دەزانن، زمانی ڕاستەقینەی توێژینەوە بەلای دیکارتەوە، زمانی ماتماتیك و بەڵگەکاری بوو. لەگەڵ ئەوەشدا زمانی ناو دەقەکانی دیکارت، لە چاو زمانی فەلسەفیی زۆرینەی فەیلەسووفانی پێشتردا زمانێکی نوێیە: "**شێوەی نووسینی دیکارت ئاسانە و هیچ فەزڵفرۆشییەکی تێدا نییە، ئەو زیاتر بۆ خەڵکانی هوشیار دەنووسێ تاکو بۆ فێرخوازان. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم شێوە نووسینە زۆر بەرزە.** ***ئەوە خۆشبەختییەکی گەورەیە بۆ فەلسەفەی نوێ کە پێشڕەوەکەی خاوەنی ئەو چەشنە ئەدەبییە بەرزە بێت"***[٦٠]. ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە دیکارت ئەم چەشنە ئەدەبییەی خۆی لە زمانی فەرەنسیدا بەرجەستە دەکات، نەك بە زمانی مامۆستاکانی، کە لاتینی بووە و پێیوایە بەوکارەی یارمەتی ئەوانە دەدات کە دەیانەوێ بەهۆی عەقڵی سروشتییانەی خۆیانەوە داوەری لەبارەی بیروڕاکانییەوە بکەن[٦١].

**دووەم:** بەو هۆیەوە کە دیکارت ماتماتیکزانێکی لێهاتوو بووە، ویستوویەتی بەسوود وەرگرتن لە میتۆدی ماتماتیکییانە بەرنامەیەك بۆ فەلسەفە دابڕێژێت و لە بواری بەڵگەکاریدا هەمان ئەو ئەنجامانە بەدەست بهێنێت کە لە ماتماتیکدا دێنە دەست و ناکرێ نکۆڵییان لێ بکرێت و گومانیان لێبکەین، وەك : (٢+٤=٦).

**سێیەم:** وێڕای ئەوانەش، دیکارت فەیلەسووفێك بوو دەیویست لە ژیانی پراکتیکی مرۆڤ تێبگات. ئەو خواستی ئەوە بوو بەچاوی پراکتیکییانەو وەك ئەوەی ژیان بەشێوەی واقیعیانە لەلایەن بکەرەکانەوە، ئەزموون دەکرێ، بژی، ئەمەش وای لێکرد چەند سەفەرێك بکات. ئەو گوتوویەتی:

**"حەقیقـەت زیـاتر لـەو قـسانەدایە کـە خـەڵك لـەبارەی ئـەو شـتانەوە دەیانکەن، کە بەلای خۆیانەوە گـرنگن، نـەك لـەوەی دەتـوانین لـە کتێبـی دانایاندا بیانخوێنینەوە"**[٦٢].

# بەشی سێیەم

## میتۆد و چەمکە گرنگەکانی فەلسەفەی دیکارت:

ئەم بەشەی توێژینەوەکەمان تەرخانکردووە بۆ قسەکردن لەسـەر ئـەو لایەنانەی بیری دیکارت کە بەرجەستەکەری ڕێبازە ئەقڵانییەتەکـەی ئـەو فەیلەسووفەن. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم لایەنە گرنگەش لە هزری دیکارتـدا، پێویـستە سـەرەتا میتۆدەکـەی بناسـین کـە بۆخـۆی ناوی نـاوە "میتـۆدی ماتماتیکییانـە"[٦٣]. پاشـان هەوڵـدەدەین لەسـێ لایـەنی گرنگـی فەلـسەفەی دیکارت بکۆڵینەوە: بیرۆکە زگماکـەکان، بیرۆکـەی بـوونی خـودا و دوالیـزم، چونکە لە ئەنجامی تێگەیشتن لەم چەمکە گرنگانەوەیە دەرگایەکی والا بە ڕووی هزری دیکارتدا دەکرێتەوە.

**یەکەم: گومانکاری[٦٤]:**

گومان و گومانکردن لە تایبەتمەندییە سروشتییەکانی مـرۆڤن[٦٥] و لـە ئاسـتی ژیـانی ڕۆژانـەدا، مێـژوویان هێنـدەی مێـژووی هوشـیاری مـرۆڤ بـە بارودۆخـەکانی نـاو ژیـانی خـۆی، دێرینەیـە. مـرۆڤ لـە ئـەنجام و لـەکاتی سەرهەڵدانی ئەو هوشیارییەوە گومان لـە شـتێك و گوتەیـەك و ڕەفتارێـك دەکـات کـە بـۆ ئـەقڵ شـیاوی دەرککـردن نییـە. لێرەشـەوە گومـان بەڵگـەی هـەبوونی هوشـیاری و مەعریفەیـە[٦٦]. گومـانکردن لـە سـەر بنـەمای دوودڵییـەوە بەنـدە و کاتـێ مـرۆڤیش دوودڵ دەبـێ هۆکـاری زۆر و ڕێگـای جۆراوجۆری دەربڕینی بەدەستەوەن. دوودڵـی لـە ئاسـتی زمـانی ڕۆژانـەدا، واتە: دڵنیانەبوون لەو شتەی کـە دەگـوترێ و دەکـرێ و گوێمـان لێـدەبێت،

کە کار و گوتەیەکی ڕاست بێ. ئێمە دەتوانین گومـان بکـەین لـەوەی کامـە سیـستەمی حـوکم، یـان سیـستەمی پـەروەردەیی بـۆ وڵاتەکـەمان باشـترە. دەتوانین گومان بکەین لەوەی زانـست بتوانـێ ڕاسـتیمان بـۆ ڕوونبکاتـەوە، یـان دکتۆرێـك بـە دروسـتی دەستنیـشانی نەخۆشـییەکەمان بکـات و هاوڕێکانمان لەگەڵمانـدا پـاك و ڕاسـتگۆ بـن و تەنانـەت گومـان لـە هەنـدێ مەسەلەی ئـەخلاقی وەك ئایـا درۆکـردن کـارێکی ناڕاسـتە و ئایـا بەڕاسـتی نیشتیماندۆستی فەزیلەتە یان نا، بکەین[٦٧].

مێژووی فەلسەفە چـەندین ڕەوت و ئاراسـتەی گومـانکردن و گومانکـارانی بەخۆیـەوە بینیـوە[٦٨]، بـەڵام گومانکـاری وەك ڕەوتێـك لـەناو مێـژووی فەلـسەفەدا، جیـاوازترە لـە گومـانی ئاسـایی ڕۆژانـە. مـرۆڤ لـەو کاتـەوەی گومـان دەکـات، مـەرج نییـە گومانکـار بێـت و نییـە، چـونکە گومانکـاری بەرزکردنەوەی گومان و دوودڵییە لـە ئاسـتی ویـژدانی و دەروونییـەوە بـۆ ئاستی هزرین و ڕامانی فەلسەفی و هۆشەکی. ڕەنگە خـاڵێکی هاوبـەش لـە نێوان گومانی خەڵکی ئاسـایی و گومانکـاری فەیلەسـووفەکان لـەوەدا بێـت، **"بە کەسێك دەڵێن گومانکار کە لانی کەم تا ئەو کاتەی بەڵگەی ڕازیکەری نەخراوەتە بەردەم تا پێی بڵێ بۆچی بـە شـێوەیەکی دیکـە ڕەفتـار بکـات، (ئــەوە ئــەو کەســە) لــەبارەی هەنــدێ مەســەلە، بــاوەڕ و تیۆرییــەوە، دوودڵە"**[٦٩]

بەم پێیەش، گومانکاری هەڵوەستە و چـالاکی و ئێـستێکی ئەقڵانییـە و لە فەلسەفەدا تەنانەت **"گومان لەو شتانەش دەکرێت، کـە هـیچ کەسـێکی ئاسایی و واقیعی گومانیان لێناکات، وەك گومانکردن لە هەبوونی جیهانی واقیعی و ئەوەی کە ئایا بەڕاستی جەستەی ئێمە و ئەو زەمینەی لەسەری وەستاوین، هەیە"**[٧٠].

لە فەلسەفەدا گوتەزای گومانکردن، واتە بەدواداچوون و عـەوداڵی بـەدوای دۆزینەوەی ڕاسـتەقینەدا بـەهۆی سـەلماندنی ژیرانـەوە، چـونکە گریمانـەی دۆزینـەوەی ڕاسـتەقینە کـارێکی هۆشمەندانـە و عەقڵانییـە، پـتر لـەوەی

سۆزدارانە و دەروونی بێت[71]: "**لە فەلسەفەدا، گومانکردن ئامرازێکی گرنگ و خاوەن ئامانجی بیرکردنەوەیە لە خودی پرۆسەی بیرکردنەوە. بۆیە ڕەهەندی گومانکردن زۆر فراوانتر دەبێ، تەنانەت ئەو شتانەش گومانیان لێ دەکرێت کە هیچ کەسێکی تر گومانیان لێ ناکات**"[72].

دیکارت هەم وەك مرۆڤێکی ئاسایی و ئەو پێشینە پەروەردەییەی لە قوتابخانەی یەسوعییەکاندا لە ناوچەی لافلاش، پێیدا تێپەڕیوە[73]، دوودڵی و گومانی خۆی هەیە و هەم ئەو دوودڵی و گومانەش بەرز دەکاتەوە بۆ ئاستی فەلسەفی و دەیکاتە گومانکاری و هەڵوێستێکی ژیرانە بۆ گەیشتن بە دڵنیایی. پرسیاری سەرەکی لەو قۆناغەدا بۆ دیکارت ئەوە بووە، ئایا چۆن بەشێوەیەکی ڕەها دڵنیابێت لە زانینەکانی خۆی و ئایا بە چییدا بزانێت، ئەوەی فێری بووە ڕاستە و هەڵە نییە؟ ئایا بە ئاماژەکردن بۆ گوتەی فەیلەسووفەکان، کە پێدەچێت پڕبن لە ناکۆکی، بە ڕاستی دەگەین؟ یان بە بڕواکردن بە هەستەکان، کە بە هەڵەماندا دەبەن؟ یاخود ئایا بە پەنابردن بۆ لۆژیك، کە بۆی هەیە هەڵە بێت و بەهۆی لۆژیکی زیاترەوە کۆنترۆڵ بکرێت، یاخود ئایا تەنیا ژیان و دیاردەکانی، ئەگەر دڵنیابووین لەوەی ژیان بۆخۆی خەونێك نییە، بۆخۆیان متمانەی ڕاستیمان لەلا دروستدەکەن، یان نا؟

بەم جۆرە "**گومانکاری لەلای دیکارت ڕێگایەك بوو بۆ گەیشتن بە دڵنیایی**"[74]. دەتوانین وەك سەرەتا بڵێین: گومانکاری لەلای دیکارت زیاتر شێواز و ستایلێکی بیرکردنەوەیە کە تیایدا پەیڕەوی لە یاسایەکی نەگۆڕ دەکات: بیرکردنەوە بەبێ خۆ هەڵەوگیرکردن بە بیروڕای پێشینەوە[75] و گەیشتن بە ئەنجامەکان، تەنیا لەڕێگەی ژیرەوە، چونکە بەلای دیکارتەوە ئەو دڵنیاییەی بەهۆی ژیرەوە پێی دەگەین، بەهۆی هەستەکانەوە نایگەینێ[76].

بەمانایەك لە ماناکان، دەتوانرێ بگوترێ، دیکارت گومان لە هەموو شتێ دەکات بۆ ئەوەی ژێر بکاتە پێوەر و بڕیاردەر لە بڕواهێنانەکانیدا بە

ڕاستەقینەی هەر شتێ. ئەم فەیلەسووفە لەو بڕوایەدایە مرۆڤ دەتوانێت بگات بە زانینی ڕەها و دڵنیا لەسەر شتەکان، ئەگەر هاتوو پشتی بە زانستی نوێی سروشت و ماتماتیك و پرنسیپەکانی بەست. ئەو لە شوێنێکدا، کاتێ باس لەو بایەخدانەی خۆی بە ماتماتیك دەکات، دەڵێ:

**"ماتماتیك چەندین داهێنانی ئەوپەڕی وردی تیادایە، هەست و نەستی شت زانین ڕازی و تەکنیك ئاسان و باری سەرشانی مرۆڤ سووك دەکەن"**[77].

هەروەها لە شوێنێکی تردا ئەم بۆچوونە پتر ڕوون دەکاتەوە تاکو بڕوای خۆی بە دیسیپلینە ماتماتیکییەکان بەتەواوی ڕابگەیەنێ و دەنووسێ: **"بەتایبەتی دیسپلینەکانی ماتماتیك لەبەر ئەو پتەوی و دڵنیایی و وردەکاریی و ڕوونییە لە بەڵگەکانیاندا، بەلامەوە پەسەند بوون"**[78]. هەربۆیەشە دیکارت لە کتێبی **(نارەزایەتییەکان و وەڵامەکان)**دا دەکەوێتە خستنەڕووی فەلسەفەکەی بە میتۆدێکی ماتماتیکییانە و بۆ یەکەم جار پرانسیپەکانی ماتماتیك دەکاتە بنەمای زانست،[79].

پێشمەرجی ئەوەی کە دەستمان بە زانینی دڵنیا بگات ئەوەیە، لەسەر ئەو بەڵگەنەویستانە کاربکەین، کە بەرەو ڕاستییەکی نکوڵی لێنەکراومان دەبەن، هەروەکو ئەو ڕاستییەی کە لە ئەنجامی کۆکردنەوەی ٢+٣=٥ بە دەستمان دەگات و ئەقڵ دەرکی دەکات. ناکرێ لەڕووی لۆژیکەوە گومان بخەینە سەر بەڵگەی لەو جۆرە و ئەگەر گومانمان لێکردن، ئەوە دووچاری ناکۆکییەکی لۆژیکی دەبین. بۆ ئەوەی دیکارت خۆی لە ناکۆکی ئەوتۆ بەدوور بگرێت و بگات بە مەعریفەی راستەقینە و دڵنیا، لە کتێبی (ڕامانەکان)دا، میتۆدە بەناوبانگەکەی خۆی، کە بە میتۆدی گومانکاری ناوی دەرکردووە، دەخاتە کار.

**بە کورتی:** ئەم میتۆدە دەیەوێ بە شێوەیەکی سیستەماتیکی (منظم)، لەوە بکۆڵێتەوە، ئاخۆ لە رووی لۆژیکییەوە ئیمکانی هەیە گومان لەهەموو ئەو شتانە بکەین، کە هەمیشە وەك (ڕاستی) قەبوڵمان کردووە؟ سەرەتا،

هەمیشە دەتوانین گومان لەو بەڵگانـە بکـەین بـەهۆی هەسـتەکانەوە و لـە میانەی ئەزموونکردندا، وەرمانگرتوون:

"هەموو ئەو شتانەی تائێستا بەوپەڕی ڕاست دامنابوون، لـە هەسـتەکانەوە یـاخود بـەهۆی هەسـتەکانەوە پـێم گەیـشتوون، بـەڵام مـن بـۆم سـاغ بۆتـەوە، هەنـدێ جـار هەستەکان هەڵخەڵەتێنەرن. ژیریی لەوەدایە بەتەواوەتی لەوانەیـە دڵنیـا نـەبین، کـە ئەگـەر تەنانـەت جـارێکیش هەڵیانخەڵەتاندین. لەوانەیە وابێ، ئەگەرچـی هەسـتەکان لە شتی زۆر ورد و بـچووك و شـتی دوورەدەسـت هەنـدێ جار هەڵمان دەخەڵەتێنن، لە هەمان کاتدا شتی تر هەیە، لـە هـەمان سەرچـاوەوە پەیـدابوون، کەچـی نـاتوانرێ گومـانێکی ئـەوتۆیان لـێ بکـرێ. بـۆ نموونـە وەك ئـەوەی ئێستا من لێرەم، جلی زستانەم لەبەردایە، لەگەڵ شتێکی تری وەك ئەمانە"[80].

هەسـتەکان چاوبەسـتمان دەکـەن و بەڵگـەی ناڕاسـتی ئـەوتۆمان لـەلا دروست دەکەن، کە بەرگەی ئەزموونکاری ناگرن. بۆ نمونە: قەڵای هەولێر لە دوورەوە شێوەیەکی بازنەیی هەیە، بەڵام لەو وێنەیەدا کە لە ئاسمانەوە گـیراوە، زیـاتر لـە شـێوەی لاکێـشەیەکی چـرچ و لـۆچ و لاشـکاودایە، نـەك شــێوەی بازنــەیی. بــەلای دیکارتــەوە ئــەم بەڵگەیــە بەڵگەیــەکی **(چاوبەستانەیە)** و مرۆڤ دەتوانێ گومان لەم بەڵگەیـە بکـات و نائومێـدبێ لـەوەی کـە ئەزموونـەکانی هەسـتەوەری بمانگەیـەنن بـە مەعریفـەی ڕاستەقینە.

"وای دادەنـێین ئێمـە خـەو دەبیـنین. هـەموو ئەمانـە، چـاوهەڵهێنان، سـەر بـادان، دەسـت پانکردنـەوە، ڕاسـت نین. با وای دابنێین نە دەست و نە ئەو جۆرە لەشەمان هەیە"[81].

لەپاش ئەمە دیکارت باس لەوە دەکات، بۆی هەیە هەموو ئەو شتە گشتیانەی وەك جەستە، چاوەکان، سەر، دەستەکان و شتی لەو بابەتە، خەیاڵیی بن، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ بە ناچاری ددان بەوەدا بێنین کە لانی کەم شتی دیکەی هەمدیسان سادەتر و گشتیتر هەن، کە ڕاستەقینەن و بوونیان هەیە. بۆنموونە سروشتی جەستەیی ئێمە و درێژبوونەوە و ئەندازە و قەبارەکەی کە بەهۆیەوە شوێن داگیر دەکات. شێوەی شتە خاوەن قەبارەکان، چەندایەتی و ڕێژەی شتەکان، ژمارە و ئەو شوێنەی کە لێی دانراون و تەنانەت ئەو کاتەی بەهۆیەوە بەردەوامییان پێوانە دەکرێ.. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا ناتوانین گومان لە بوونی ڕاستەقینەی هەموو ئەمانە نەکەین.

ئەوە سەبارەت بە شتە گشتی و پێکهاتووەکان، بەڵام ئایا دەتوانین گومان لە ڕستە ماتماتیکییەکانی وەك (٢+٤=٦) بکەین؟ دیکارت لەسەرەتاوە دەیەوێ بڵێ: گومانکردنی ئەوتۆ ڕێی تێناچێ چونکە:

> **"من بەخەبەر بم یاخود نوستووبم هەمیشە ٢+٣ ئەکاتە پێنج، چوارگۆشە هەرگیز لە چوار لا پتری نییە"**[(٨٢)]

لەپاش ئەمە، دیکارت زوو دەکەوێتە باسکردنی بڕوای خۆی بە ڕەببێکی دەسەڵاتدار کە هەم ئەوی ئەفراندووە و هەم دەتوانێ هەر شتێکی دیکە بکات کە بیەوێ. لێرەوە دیکارت پرسیار دەکات و دەڵێ، من لە کوێوە بزانم کە ئەو ڕەببە نەیویستووە، کە هیچ زەوی و ئاسمانێ، هیچ لەشێکی قەبارەدار، هیچ شێوە و فۆرمێك، هیچ ڕێژە و شوێنێ، بوونیان نەبێت و لەگەڵ ئەوەشدا من هەستم بە هەموو ئەوانە هەبێ و هەموو ئەو شتانە بێجگە لەو جۆرەی کە دەیانبینم لە بینایيمدا بوونیان نەبێ؟ ئەگەر هێزێکی لەوجۆرەی دەسەڵاتدار لە دەرەوەی ئیرادەی خۆمان فەرمان بە هەستەکانمان بکات، مانای ئەوەیە کە ئەو هێزە دەشتوانێ لە کۆکردنەوەی دوو و سێدا بە هەڵەمدا بەرێ:

**"من لەو باوەڕەدام کەسانی تر هەن لەو شتانەدا کە وا ئەزانن دەیانزانن، دەکەونە هەڵەوە، دەکرێ بە هەمان شێوە ئەگەر من دوو لەگەڵ سێ کۆ بکەمەوە، یاخود لایەکانی چوارگۆشە بژمێرم یاخود بیر لە شتی ساکار بکەمەوە بکەومە هەڵەوە."(٨٣)**

بەم جۆرەش لە کۆتایی ڕامانی یەکەمدا دەکەوێتە خستنەڕووی ئەو بەلگەیەی کە دەکرێ بە بەلگەی شەیتانی ناوببرێ، چونکە تیایدا دەڵێ، ئیمکانی ئەو گومانکردنە لە ئارادا هەیە، ئەمەش بەو هۆیەوە کە دەگونجێ نەك ڕەب، کە چاکەی هەرە بەرزە، بەڵکو (هێزێکی شەڕانی، یان شەیتان)ێك هەبێ، هەوڵبدات ئێمە بهێنێتە سەر ئەو قەناعەتەی کە بۆ نموونە: ڕستە ماتماتیکییەکان ڕاستن و ئێمەش بڕوامان پێکردبێ، لە کاتێکدا بەواقعیی و بە ڕاستی ئەو ڕستانە هەڵەبن و کۆی سێ و دوو نەکاتە پێنج. بۆیە ئەوجۆرە بەلگەیەی بە شەیتانی ناوی برا، ئەو بەلگەیە کە تیایدا بەدکارێك، یان شەڕخوازێك، شتێ بخاتە زەینمانەوە کە لە واقیعدا پێچەوانە بێت:

**"کەوابوو دەمەوێ وای دابنێم، نەك خوا کە ئەوپەڕی چاك و سەرچاوەی ڕاستی و حەقیقەتە، بەڵکو گیانێکی بەدکار کە ئەوپەڕی بەهێز و بەدەسەلات و تەفرەدەر و هەڵخەڵەتێنەرە، هەموو بلیمەتییەکەی خۆی بۆ هەڵخەڵەتاندنی من بەکاردێنێ، دەمەوێ وای دابنێم، ئاسمان، هەوا، زەوی، ڕەنگ، وێنە و ڕوخسارەکان، دەنگەکان و شتە دەرەکییەکان لە گەمەی هەڵخەڵەتێنەری خەون بەولاوە نین کە ئەو بلیمەتە وەك داوێك بۆ خۆشباوەڕیی من ناوێتیەوە. دەمەوێ خۆم وا دابنێم، نە دەست و نە چاو، نە گۆشت و نە خوێن و نە هیچ هەستێکم هەن، بەڵکو بە هەڵە بڕوام کردووە من ئەمانەم هەن"(٨٤)**

له درێژەی ڕامانەکانیدا، دیکارت دەگاتە ئەو بڕوایەی کە تەنیا یەك شت هەیە ناتوانێ گومانی لێبکات، ئەویش ئەو بیرکەرەوەیەیە، کە گومان دەکات. دیکارت ناتوانێ گومان لەو (خود)ـە بکات، کە گوماندارە و بۆی هەیە لەلایەن هەستەکان و شەیتانەوە هەڵخەڵەتێنرابێت، بەڵام ئەو خودە بوونی هەیە چونکە بێمانایە لە رووی لۆژیکییەوە بتوانێت گومان بکات و لەهەمان کاتیشدا لە خشتە برابێت و هەڵخەڵەتێنرابێت. هیچ هێزێکی شەڕانی ناتوانێ خودێکی گومانکار لە خشتە ببات، کە بڕوای بەبوونی خۆی هەبێت: کەواتە من نە هەستەکانم هەن و نەجەستەم.. پاشان بڕوام بەوە هێنا کە لە جیهاندا هیچ شتێ بوونی نییە، نە ئاسمان، نە زەوی، نە زەین و هۆش و نە جەستە. بەڵام ئایا من بۆخۆشم بوونم نییە؟ نەخێر دەبێت من بوونم هەبێ. تەنانەت ئەگەر شەیتانێکی فێڵباز و بەدەسەڵات بەردەوام خەریکی فریودانی من بێ، هێشتاکەش (من)ێ هەیە کە گومان دەکات. کەواتە لێگەڕێ با لە خشتەم ببات:

> **"ئێستا ئەگەر ئەو بە فریوم بەرێت ئەوا گومانی تیادا نییە کە من هەم. ئەو ئەوەندەی لەدەستی بێت هەڵم دەخەڵەتێنێ، بەڵام هیچ کاتێك ناتوانێ بگاتە ئەو ڕادەیەی من بکات بە هیچ مادام من بیر دەکەمەوە کە من شتێکم. ئیتر من دێمە سەر ئەوەی، پاش ئەوەی پتر لە پێویست لە هەموو شتەکان ورد و قووڵ بوومەوە، ئەم ڕستەیە هەر کاتێك ناوم هێنا، یاخود بە بیرمدا هات: (من هەم، من بوونەوەرم) بەناچاری ڕاستە"**(٨٥)

ئێستە دیکارت دەزانێ کە ***هەیە***، چونکە بیر دەکاتەوە و تا ئەو کاتەی بیر بکاتەوە بوونی هەیە و لەگەڵ وەستانی لە بیرکردنەوە، بوونیشی دەوەستێ. بوونی هەبوو لە بیرکردنەوەیەوە دێت، بۆ ئەوەی هەبێ، دەبێ لەبیرکردنەوە بەردەوام بێ و هەر ئەو (خود)ـەش کە دەزانێ هەیە، لەوە دەکۆڵێتەوە کە ئەو ***چییە***؟ ئایا بەڕاست (خود) چییە؟ دیکارت دەڵێ: ئەو

شتەیە کە بیر دەکاتەوە (Res Cogitans)، بەلام ئەو شتەی بیر دەکاتەوە چییە؟

دیکارت دەنووسێ شتی بیرکەرەوە بریتییە لە: "**جەوهەرێك، گومان دەکات، تێدەگات، شت پەسەند دەکات، ناکات، دەخوازێ، نایەوێ، وێنەئاسا**[٨٦] **بۆ شت دەچێ و هەست دەکات**"[٨٧]

بیرکردنەوە بە تەنیا پێناسەی هەبوویەك نییە، ئەگەر ئەو هەبووە لە هەمان کاتدا گومانکار نەبێ، بۆیە پێوەری یەکەمی دیکارت دەبێتە: ***(من گومان دەکەم، کەواتە هەم)***. بیرکردنەوە لەلای دیکارت پرۆسەیەکە، ڕەوتی بوونە، بەلام لەناو ئەم ڕەوتەدا کردەیەك و چالاکییەك هەیە کە گومانکردنە. گومانکردن بەلگە و نیشانەی بیرکردنەوەیە؛ کە خۆی وەك کردە و چالاکییەکی جەوهەریانەی بکەری بیرکەرەوە، بەرجەستە دەکات. بکەری بیرکەرەوە پێویستە لە بیرکردنەوەکەیدا گومانکارانە بیر بکاتەوە، تاکو بیرکردنەوەکەی ببێتە بەلگە و نیشانە لەسەر بوونەکەی:

> **"گومانکردن بەلای دیکارتەوە، جووڵەیەکی ساکاری هزرینە کە ڕاستەوخۆ پێناسەی هەبوو دەکات: بەم جۆرەش گوتەی "من بیردەکەمەوە" یان "من گومان دەکەم"، خۆبەخۆ "من هەم"یش لەخۆی دەگرێ"**[٨٨].

لە ڕستەیەکی تری بەناوبانگدا، کە دیکارت لە (میتۆد)دا دایڕشتووە، مانای ڕستەی یەکەم بەم جۆرەیە: (Cogito, ergo sum = من بیر دەکەمەوە، کەوابوو من هەم)[٨٩]. ئەو (خود)ەی کە ئیدی ناتوانین گومانمان لە بوونی هەبێ، بێگومان کەسێك نییە لە جەستەیەکی فیزیکیدا بەڵکو تەنیا (شتێکی بیرکەرەوەیە) (res cogitans)، یان جەوهەرێکی بیرکەرەوەیە. گرنگترین تایبەتمەندی ئەم جەوهەرە بیرکەرەوەیە ئەوەیە، ئاگایە بەبوونی خۆی و ئەمەش بنەمایەکی دڵنیاکەرە بۆ گەیشتن بە مەعریفەی ڕاستەقینە. چونکە ئەو (من)ەی گومان دەکات، هوشیارە بە گومانکردنی خۆی.

## دووەم: بیرۆکە زگماکەکان:

**چەمکی بیرۆکە:**

دیکارت زاراوەی (Cogitatio) یان (Thought) بۆ هزر، بیر، یان فیکر بەکاردەهێنێ و لە پێناسەکردنیدا دەنووسێت:

> **"هزر وشەیەکە، هەر شتێ دەگرێتەوە وا لە زەینی ئێمەدایە و بەبێ هۆکار لە ئاستیدا هوشیارین"[٩٠]**

لە بەرامبەر ئەمەشدا زاراوەی (idea) بۆ بیرۆکە بەکاردەهێنێ و وەك فۆرمی هەر هزرێك (form of any thought) دەیناسێنێ:

> **"مەبەستی من لە بیرۆکە، فۆرمی هەر هزرێکە، واتە ئەو فۆرمەی کە بەهۆی تێگەیشتنی بێ واسیتەوە، من لێی بە ئاگام، بەجۆرێ کە ناتوانم هیچ شتێ بڵێم و بە زمانمدا بێت، مەگەر لە زەینی خۆمدا بیرۆکەیەکم لەسەر مەدلولی ئەو وشانە هەبێت"[٩١].**

بەم مانایە و لە بۆچوونی دیکارتەوە، **"بیرۆکە بریتییە لە ئاگایی یەقینییانەی مرۆڤ لەسەر خۆی"[٩٢]**. پرۆسەی هزرین تا ئەوکاتەی لە زەینی بیرکەرەوەدایە، بۆخۆی هیچ جۆرە فۆرمێکی ئیدراکیانەی نییە، بەڵام کاتێ ئەم پرۆسەیە فۆرمێکی تایبەت وەردەگرێ، دیکارت بەم فۆرمە دەڵێ بیرۆکە، یان ئایدیا[٩٣]. لەوێشەوە کە دیکارت بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی جگە لە بیرکردنەوە و هزرین هیچی تری نییە و ڕەنگدانەوەی هزریش لە زەینی مرۆڤدا لە شێوەی بیرۆکەدا بەرجەستە دەبێت، ئەوە گرنگیی چەمکی بیرۆکە لە فەلسەفەی دیکارتدا دەردەکەوێ[٩٤]. لە هەمان شوێندا دیکارت ئەوە ئاشکرا دەکات، کە بەکارهێنانی ئەو بۆ زاراوەی بیرۆکە، زۆر فراوانە و دەنووسێ:

> **"بەم جۆرە، تەنیا هەر ئەو فۆرمە خەیاڵییانەی لە خەیاڵداندا بەرجەستە دەبن، بە بیرۆکە ناو نابەم و تەنانەت لێرەدا ئەم وێنانەش لەبەر ئەوەی وێنەی ناو خەیاڵدانی**

**مـادین، واتـه لـه بەشـێ لـه مێـشکدان، بـەهیچ شـێوەیەك بـه بیرۆکه ناوزەد ناکـەم. بـەڵکو لەبـەر ئـەوە بـه بیرۆکـه ناویـان دەبەم لەبەرئەوەی کاتێ زەین لـەو بەشـەی مێـشك بەئاگایـە، بیرۆکەکان دەبنە فۆرمی زەین خۆی"[٩٥]**

بە مانایەکی تـر، کاتـێ یـەکێك لـە هەسـتەکانی ئێمـە لەلایـەن شـتێکی دەرەکییەوە، بۆ نموونە ڕووبارێکەوە، دەبزوێن و ئەم بزوانەش لـە ڕێگـەی زنجیرەی دەمارەکانەوە دەگاتەوە مێشك و کاری تێدەکات، یان وەك دیکـارت دەڵێت: لە "**خەیاڵدانی مادی**"دا وێنەیەك لەسەر ڕووبارەکە دروستدەبێت، ئەوە زەین، یان نەفس بەرەو ئەو شتە، یان ئەو وێنەیە ئاراستە دەبێ و لە ئەنجامی ئەمەشەوە، فۆرمێکی دەرککراو لە زەیندا دروستدەبێت، کـە پێـی دەگـوترێ بیرۆکــه، یــان ئایــدیا و ئــەم بیرۆکەیــەش بــەلای دیکارتــەوە بیرۆکەیەکی زگماکە و بەکاری دەهێنێ بۆ سەلماندنی بوونی خودا.

**بوونی خودا:**

دیکارت لە ڕامانە میتافیزیکییەکانیدا و لە ڕامانی سێیەمدا[٩٦]، بەدوای دارشـتنی ڕسـتەی: (مـن بیردەکەمـەوە، کـەوابوو مـن هـەم)، ڕاسـتەوخۆ، دەکەوێتە سەلماندنی هەبوونی خودایـەکی کـامڵ ، خودایـەکی بەدەسـەڵات، هەمیـشەیی و خـودای هـەموو شـتێ. هـەروەها لـە کتێبـی (***نارەزایـەتی و وەڵامەکاندا***) بە شێوەیەکی ڕوون پێناسەی خودا دەکات و دەڵێت:

**"ئەو جەوهـەرەی بـە کـامڵ و ڕەهـای دەزانـین و لـەودا بــەهیچ شــێوەیەك شــتێ نابینینـــەوە کـــە نیـــشانەی کــەموکوڕی و ســنووردارییی ئــەو بێــت، پێیــدەگوترێ خودا"[٩٧].**

ئەگەر مرۆڤ بتوانێ بوونی خودایەکی ئاوها بسەلمێنێ، ئـەوە دەشـتوانێ لەوە دڵنیابێ کاتـێ بـە ڕوونـی بیردەکاتـەوە، هـیچ هێـزێ نییـە بتوانـێ لـە خشتەی بەرێ. هۆی ئەوەی کە مرۆڤ گومانی لە هێزە بـەدکارەکان دەکـرد، ئەوە بوو، نەکا ئەو شتانەی بەخەیاڵیـدا دەهـاتن لـە هێزێکـی شـەڕانییەوە

هـاتبن. وەلـێ ئەگـەر بیرۆکـە و وێناکردنـە بـەد و شـەڕانییەکان، لـە خودایەکی کامڵەوە هاتبن، ئەوە مرۆڤ دەتوانێ دڵنیا بێ لەوەی کە ڕاستن. هەروەها ئەوەش دژی سروشتی خودایەکی کامڵ دەبوو، گەر هاتبا و ئـەو خودایە مرۆڤی بەو جۆرە دروستکردبا: کە هەمیشە بـەهۆی هەستەکانی خۆیەوە بکەوێتە هەڵەوە.

خاڵی سەرەتایی دیکارت بۆ سەلماندنی بوونی خودا ئەوەیـە کـە دەڵێـت، ئـەو بۆخـۆی وەك (جەوهـەرێکی بیرکـەرەوە)، خـاوەنی وێنـاکردن، یـان بیرۆکەیەکە لەسەر خودا وەك بووێکی کـامڵ. ئـەم بیرۆکەیـە لـە سروشـتی مرۆڤدا هەیە و پێوەی لەدایك دەبێت، واتە بیرۆکەیـەکی زگماکـە. دیکـارت لە کۆتایی ڕامانی سێیەمدا سەبارەت بە بـوونی بیرۆکـەی خـودا لـە خـودی خۆیدا، نووسیویەتی:

> **"من ئەمەم بە خەیاڵ دروست نـەکردووە چونکە مـن نـاتوانم شـتی تـری بخەمـە سـەر یـاخود شـتی لـێ کـەم بکەمەوە. بۆیە لەوە بەولاوە (شتێ) نامێنێتەوە بوترێ کە ئەو بۆچوونە وەك ئەو بۆچوونەی دەربارەی خۆمە، زگماکە لە مندا"**[٩٨].

هەروەها لە کتێبی (***نارەزایەتی و وەڵامەکان***)دا چـەندجارێك دێتـەوە سەر ئەم باسە و بەرگریی لە هەبوونی بیرۆکەیەك لەسـەر خـودا دەکـات و دەڵێ:

> **"ئەو بیرۆکەیە بیرۆکەیەکی زگماکە لە مندا" و "ئەگەر دروسـتکراوی خـودا نـەدەبووم، مـەحاڵ بـوو بتـوانم بیرۆکەیەکی ئەوتۆ لە مندا بوونی هەبێ"**[٩٩]

ئەمـەش بـەمانای ئـەوە نییـە کـە چـەمکی خـودای کـامڵ ، بـێ کۆتـا (Infinite)، سـەربەخۆ (Independent)، بەهـەموو شـت توانـا (All Powerful)، بەهـەموو شـت دانـا (All Knowing)، لـە (مـن)ەوە سەرچاوەی گرتبێ، چونکە (من) بۆ خۆی کامڵ نییـە و ئەمـەشمان لـەوەدا

بۆ دەردەکەوێ کە (من) دەتوانێ (گومان) بکات و هێشتا دڵنیا نییە[١٠٠].
بەم پێیەش، چەمکی (خودایەکی کامڵ) بیرۆکەیەکە، تەنیا دەبێ لە سەرچاوەیەکی کامڵەوە هاتبێ کە لە دەرەوەی هوشیاریمانەوەیە و ئەو سەرچاوەیەش خودا بۆ خۆیەتی و ناکرێ شتێکی تر بێ. دیکارت دەنووسێ:

> "کاتێك سەرنجی خۆم ئەدەم، تەنیا ئەوەم بۆ دەرناکەوێ کە من شتێکی ناتەواوم، پشت بە جەوهەرێکی تر دەبەستم و هەمیشە دەزانم ئەوەی من پشتی پێ دەبەستم هەموو ئەو شتە مەزنانەی کە من هەوڵیان بۆ ئەدەم و لەناخی خۆمدا بۆچوونیان لەبارەوە دەبینم، نەك وەك شتێکی شیاوەکی بەڵکو وەك شتێکی ڕاستەقینەی کردەکی بێ کۆتایی تیادایە، ئەویش خوایە. هێزی ئەم بەڵگە لەو زانینەدایە، بەپێی سروشتی تایبەتی من کە بۆچوونێکم دەربارەی خوا لە ناخدایە، بەبێ بوونی راستەقینەی خوا ناکرێ من هەبووبم"[١٠١].

بەم شێوەیە ئاگایی ئێمە، یاخود جەوهەری بیرکەرەوە ئیمکانی هەیە زنجیرەیەك وێناسازی هەبێت کە پێیان دەگوترێ (بیرۆکە زگماکەکان) و ئەمانە بەهۆی ئەزموونکردنەوە دروست نەبوون، بەڵکو ڕەگەز و سەرچاوەکەیان دەچێتەوە سەر خودا و بەشێوەیەکی خۆڕسك لە مرۆڤدا هەن.

**ئەوەی کە دەڵێن:** ئەم بیرۆکانە زگماکن، یان خۆڕسکن، بەمانای ئەوە نییە هەردەم هوشیاریی و ئاگاییمان دیار و ئاشکرایە. منداڵێك هیچ بیرۆکەیەکی لەسەر (خودایەکی کامڵ) نییە. بەڵکو بەمانای ئەوەیە کە ئەقڵی ئێمە لە میانەی گەشەکردن و پێگەشتنی خۆیدا و بەهۆی کاریگەربوونی بە فاکتەرە دەرەکییەکانەوە، دەتوانێت ئەم بیرۆکە

زگماکانــه دابنــێ. هـۆی ئەمــەش دەگەڕێتــەوە بـۆ ئــەوەی کـە ئێمـە وەك (شتێکی بیرکەرەوە) واتە وەکو بـووی ئـەقلانی لـە وێنـەی خـوادا دروسـت بووین. ئەمەش بەمانای ئەوەیە ئێمەش بەشمان هەیە لـە ئـەقڵ و زەینـی خوداییـدا، هـەر بۆیەشـە لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا گـوتراوە: "**خـودا کـە مرۆڤی دروستکردووە بەشێ لـە ژیریـی ڕەببـانی خۆشـی تێـدا سـەقامگیر کردووە**"[١٠٢].

کەواتە زانینی مرۆڤ دوو سەرچاوەی پێویستی خۆی هەیـە: یەکـەمیان لەڕێگـەی هەسـتەکانەوە، دووەمیـشیان: ئــەو بیرۆکــە زگماکییانــەی کــە هـەڵگری بەشـێ لـە خەسـڵەتەکانی عـەقڵی (کـەماڵ)ی خـودایین و لـەژێر کاریگەری ئەزموونەکانـدا دروسـت نـەبوون. تێگەشـتن لـەم دوو سەرچـاوە مەعریفیە دەمانخاتـە سـەر ڕێگـای بیرکردنـەوەی زانـستی، چونکە زانـست واتــا بــەکارهێنانی لایەنــە ژیــر و ئاوەزمەنــدەکانی مەعریفــە، بــەپێی میتۆدێکی دروست بۆ تێگەشتن لە سەرچاوەی ئەزموونکراو.

یـان بەمانایـەکی دی: زانـست واتـە هەڵـسەنگاندنی ئـەو زانیاریانـەی لەڕێگــەی هەســتەکانەوە ئــەزموونمان کــردوون، بــەهۆی مەعریفــەی ئەقلانییــەوە. مەعریفـە و زانـین بـە شـێوەیەکی گـشتی و مەعریفـەی ئـەقلانی لـە ڕوانگـەی دیکارتـەوە، زانـین و مەعریفەیـە بـە بـوونی خـودا. بـوونی یـەقینی و دڵنیایانـەی خـودا پێـشمەرجە بـۆ گەیـشتن بـە زانـین: "**نــاتوانین مەعریفــەی دڵنیاکــەرمان بــە هــیچ شــتێك هــەبێ، ئەگــەر لەسەرەتاوە نەزانین خودا هەیە**"[١٠٣]

بۆیە دیکارت میتۆدێك و مۆدێلێکی ئیـشکردن پێـشنیار دەکـات، کـە لـە ڕێگەیەوە دەتوانێ زانینی ڕاستەقینە بەدەست بهێنێ. ئەم مۆدێلەش خۆی لە چوار پرانسیپ و بنەمادا دەبینێتەوە، کە ئەمانەن:

**بنەمای یەکەم:** "هیچ جارێـك شـتێك بـە ڕاسـت دانـەنێم ئەگـەر دڵنیـا نەبم لەوەی کە ڕاستە. واتە، خۆم لە بڕیاری خێرا و پێـشەکییانە ببـوێرم، دەربــارەی هــیچ شــتێك بڕیــار نــەدەم ئەگــەر ئــەو شــتە بــە ڕوون و

ئاشکراییەکی ئەوتۆ نەکەوێتە بەر بیرم و نەیزانم کە دەرفەتی هیچ گومان لێکردنێکی نادات".

**بنەمای دووەم:** "هەریەکێك لەو کێشانەی دەمەوێ لێیان بکۆڵمەوە، بەپێی توانا و بەپێی پێویست بە چەند بەشێکەوە دابەشی بکەم بۆ ئەوەی چارەسەرکردنەکەی ئاسان بێت".

**بنەمای سێیەم:** "بەجۆرێکی ڕێکوپێك و گونجاو بیر بکەمەوە، واتە، بە سادە و ئاسانترین شتێك کە لە تواناداپە بزانرێ دەست پێ بکەم بۆ ئەوەی وردە وردە، پلە ئاسا، بە وانە بگەم لە چەند شتێکی پێکهاتوو لێك دراون، ئینجا ڕێکوپێکی بخەمە ناو ئەو شتانەی سروشت ئاسا بەدوای یەکتریدا نایەن".

**بنەمای چوارەم:** "لە هەموو شوێن و بارێکدا سەرژمێرییەکی تەواوەتی و پیاداچوونەوەیەکی سەرتاپاگیر بکەم بۆ ئەوەی دڵنیابم هیچ شتێکم لەبیر نەچووە"[١٠٤]

ئەم چوار پرانسیپە، ڕێنماییەکانی دیکارتن بۆ توێژینەوەی لە هەموو بابەتێکی دیاریکراو. وەك ئاشکرایە، دیکارت بە هۆیانەوە هیچ جۆرە مانا و ناوەڕۆکێکی تایبەت ناسەپێنێ، بەڵکو تەنیا شێوەی گەیشتن بە ئەنجامی لۆژیکی دەخاتە ڕوو. ئەوەی دیکارت بەهۆی ئەم پرنسیپانەوە دەیخاتە ڕوو، بریتییە لە جیهانبینییەکی تەواو دنیایی سەبارەت بە دیاردەکان و مەسەلەکانی ژیانی مرۆیی بۆ زانایان و بیرمەندان. بەڵام ژمارەیەك لەو زانا و فەیلەسووف و بیرمەندانە تەفسیری هەڵەیان بۆ مەبەستەکانی دیکارت کرد و کەوتنە ڕەخنەلێگرتن و تەشەرلێدانی و ئەمەش دیکارتی ناچارکرد بە وردی وەڵامیان بداتەوە و ئەوەی پێشتر لە کتێبە فەلسەفییەکانیدا سەبارەت بە بیروڕاکانی نەینووسیبوو، لە وەڵامەکانیدا بینووسێ و مەبەستەکانی خۆی ڕوونتر بکاتەوە[١٠٥]. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم فەیلەسووفە ڕووبەڕووی سانسۆری هەمەجۆر کرایەوە و هەر لەبەرئەوەش بوو کە لەو ڕۆژگارەدا کتێبی (***گوتار***) لەلایەن کەنیسەی کاتۆلیکییەوە بە

کتێبێکی دژە ئایینی لەقەڵەمدرا و ئەمەش دیکارتی ناچار کرد هەڵێ بۆ هۆڵەندا.

**سێیەم: دوالیزم: (Dualism)**

دوالیزم، جۆر و شێوازێکە لە بیرکردنەوە کە لەسەر ئەو بڕوایە کار دەکات، کە بوون دوو جەمسەر، یان سەرچاوەی هەیە. دوالیزم وەك شێوازێك بۆ بیرکردنەوە و تەفسیری بوون، نە تایبەتە بە فەلسەفە و نە بە فەلسەفەی خۆرئاوا بەگشتی. ئەم بیروڕایە هەم لە ئایینەکان و هەم لە فەلسەفەکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوادا ناسراوە.

ئەوە ڕاستە کە ئایینی ڤیدانتا (Vedanta) لە هیندستانی کۆندا، ئایینێکی (مۆنیستیك)، واتە تاکباوەڕانەیە، بەڵام یەکێ لە فەلسەفە و ئایینە هەرە کۆن و گرنگەکانی هیندستان، کە فەلسەفەی (سانکهیا، Sankhya)یە، بڕوای بە دوالیزمی مادە، یان سروشت و ڕۆح هەیە[١٠٦]. هەروەها هەریەك لە فەلسەفەی چینی و ئایینی زەردەشتیش لەسەر بنەمای بڕوابوون بە دوالیزمەوە دامەزراون. یەکەمیان بڕوای بە یانگ (yang) و یین (yin) و دووەمیشیان بڕوای بە ڕووناکی و تاریکی هەیە وەك دوو بنەما و سەرچاوە و هێزی سەرەکی بوون[١٠٧].

لە ئەوروپاش، مێژووی زاراوەی دوالیزم، یان بیرکردنەوەی (جووت جەمسەری) هێندەی مێژووی هزر و فەلسەفەی ئەوروپی خۆی کۆنە. لە زمانە ئەوروپاییەکاندا، ڕەگی وشەکە بریتییە لە وشەی (dualis) و ئەمەش وشەیەکی لاتینییە و بەمانای (هەڵگری دوو جەمسەر) هاتووە. زاراوەکە بۆ ئەو تیۆریە میتافیزیکییانە بەکار دەهێنرێ کە یان:

**⋆ باوەڕیان وایە بوون دوو جەوهەری هەیە، یاخود:**

⋆ بڕوایان بەوەیە هەموو بووێك لە بنەمادا لە دوو جۆر پێکهاتووە، یان دەبێ لەسەر بنەمای دوو پێکهاتەی جیاوازەوە لێکبدرێتەوە[١٠٨] نموونەی ئەو دوالیزمانەش بریتین لە دوالیزمی پیتاگۆرییەکان وەك (سنووردار و بێ سنوور، تاك و کۆ، یەك و فرە، ڕاست و چەپ، نێر و مێ، وەستاو و

جووڵاو، تیره و چه‌ماوه، ڕووناکی و تاریکی، چوارگۆشه و لاکێشه  و باش و خراپ) و هتد[109]، یا دوالیزمی ئه‌فلاتوونی له نێوان نه‌فس و جه‌سته، یان دوالیزمی دیکارتییه‌کان له‌نێوان زه‌ین و مادده و خود و بابه‌ت[110]، یاخود دوالیزمی کانتیانه له‌نێوان جیهانی دیارده‌کان وه‌ك ئه‌وه‌ی له خۆیاندا هه‌ن و جیهانی واقیعی وه‌ك ئه‌وه‌ی بۆ ئاگایی مرۆڤ خۆی ده‌نوێنێ[111].

**- دوالیزمی دیکارتیانه:**

له مێژووی فه‌لسه‌فه‌ی مۆدێرندا، دوالیزمی دیکارتی (نه‌فس و جه‌سته)، له هه‌موو جۆره‌کانی تری دوالیزم به‌ناوبانگتره. به‌پێی ئه‌م بیرکردنه‌وه‌یه هه‌موو جه‌وهه‌رێك، یان ئه‌وه‌تا جه‌وهه‌رێکی (نه‌فسی و نامه‌تریاڵییه)، یاخود ئه‌وه‌تا جه‌وهه‌رێکی (مه‌تریاڵییه). بۆ ئه‌وه‌ی له‌مه تێبگه‌ین، پێویسته بزانین دیکارت چۆن زاراوه‌ی جه‌وهه‌ر پێناسه ده‌کات. ئه‌و له‌م باره‌یه‌وه نووسیویه‌تی:

> "به شتێك ده‌ڵێین جه‌وهه‌ر (substance)، که هه‌رشتێکی که لێی تێده‌گه‌ین، واته هه‌ر تایبه‌تمه‌ندی، چۆنایه‌تی، هه‌ر خه‌سڵه‌تێك، که بیرۆکه‌یه‌کی واقیعیمان له‌باره‌یه‌وه هه‌یه، به شێوه‌یه‌کی بێ واسیته (له خودی جه‌وهه‌ره‌که‌دا)، هه‌بێت  - به‌هه‌مان شێوه‌ی که له گریمانه‌یه‌کدا هه‌یه، یان به‌هۆیه‌وه بوونی هه‌بێت. ته‌نیا بیرۆکه‌یه‌ك، به‌مانای وردی ئه‌م وشه‌یه له‌سه‌ر خودی جه‌وهه‌ر هه‌مانبێ، ئه‌وه‌یه که جه‌وهه‌ر شتێکه تیایدا، ئه‌و شته‌ی له ڕێگای هه‌سته‌کانه‌وه ده‌رکی ده‌که‌ین، واته یه‌کێ له‌وانه‌ی له وێناکردنه‌کانی ئێمه‌دا به‌شێوه‌یه‌کی زه‌ینی (ئۆبجه‌کتیڤ) بوونیان هه‌یه، به هه‌مان شێوه یان به جۆرێکی بالاتر له خودی جه‌وهه‌ره‌که‌دا بوونی هه‌بێت. چونکه به‌هۆی نووری

**زگماکەوە دەزانین کە مەحاڵە خەسڵەتێکی واقیعی، خەسڵەتی شتێکی لەناوچوو بێت"[112].**

لە ڕوانگەی دیکارتەوە، جەوهەری نەفس و جەستە، پێکەوە کۆنابنەوە، چونکە هەریەکەیان خەسڵەتی دژ بەوی تریانی هەیە و دەبێ بە جیا لێیان تێبگەین[113]. دیکارت یەکەم جار ئەم جیاوازییەی لە (ڕامانی دووەم)دا خستە ڕوو:

**"نەفس چییە؟ ئەگەرچی: یان مشووری ئەوەم نەخواردووە بیزانم، یاخود ئەگەر هەڵوەستەم کردبێ بۆئەوەی بیزانم، ئەوا وێنەیەکی ئاوهام لەبارەیەوە لە مێشکدا نەخشاندووە وەك ئەوەی با، ئاگر، یاخود ئەتیر(کزەبایەکی فێنك) وایە کە بەنێو ئەندامە درشتەکانی لەشمدا پەرتە دەکات"[114].**

هەروەها لە هەمان شوێندا، سەبارەت بە لەش نووسیویەتی:

**"من وا لە لەش دەگەم هەموو ئەو شتەیە لەلایەن وێنە و ڕوخسارێکەوە سنووری بۆ ڕێژراوە، شتێك بەپێی جێگا دەگرێ پێناسە بکرێت و بەجۆرێك شوێنێك دەگرێ و پڕ دەکاتەوە کە جێی هیچ شتێکی تری تێدا نەمێنێ. شتێکە بەهۆی هەست، دیتن، بیستن، چێشتن، یاخود بۆنکردنەوە پەی پێدەبرێ و هەستی پێدەکرێ، هەروەها بەجۆری جیاواز دەکرێ بجوولێتەوە، نەك لەخۆیەوە بەڵکو لەلایەن شتێکی ترەوە کە بەری دەکەوێ"[115]**

پاشان لە چەند شوێنێکی کتێبی (*ئارەزایەتییەکان و وەڵامەکاندا*)، وردتر و ڕوونتر ئەم جیاوازییانە دەستنیشان دەکات و دەنووسێ:

**"لە ڕێگەی ئەو بیرکردنەوەیەوە کە پێمدەڵێ جەستە درێژبوونەوەیە، شێوەی هەیە، دەتوانێ بجووڵێ و شتی**

**لەم جۆرە و هەروەها لەڕێگەی سەندنەوەی هەرشتێ کە پەیوەستە بە چییەتی نەفسەوە، بە شێوەیەکی تەواو تێدەگەم، کە جەستە چییە {واتە جەستە وەك شتێکی کامڵ وێنا دەکەم}، هەروەها بە پێچەوانەشەوە، ئەگەر چاو لەوە بپۆشم کە هەرشتێ لە بیرۆکەی جەستەدا هاتووە، پەیوەستە بە نەفسەوە، دیسانەوە هەر تێدەگەم نەفس شتێکی کامڵە کە گومان دەکا، دەزانێ، خوازیارە و شتی لەو جۆرە. ئەمە (واتە تێگەیشتن لە نەفس و جەستە بە شێوەیەکی تەواو سەربەخۆ، وەك هەبووی کامڵ و تەواو جیاواز لە یەکتر)، شیاوەکی نییە، ئەگەر جیاوازییەکی واقیعی لە نێوان نەفس و جەستەدا نەبێت"(١١٦)**

یاخود پاشتر لەمەش ڕوونتر دەنووسێ و دەڵێ:

**"ئێمە نەفس، واتە جەوهەری بیرکەرەوە بە ئاشکرا، سەربەخۆ لە جەستە، واتە جەوهەری درێژبوونەوە، دەرك دەکەین. بە پێچەوانەشەوە، دەتوانین (هەروەکو ئەوەی هەموو پەسەندیانە)، جەستەش سەربەخۆ لە نەفس تێبگەین"(١١٧).**

هەروەها بۆ پتر تیشك خستنە سەر ئەم دوالیزمە، دیکارت نموونەی تری بەرجەستە دەهێنێتەوە و دەنووسێ:

**"ئەگەر دەست، سەبارەت بە لەشێ کە ئەم دەستە بەشێکییەتی، لەبەرچاو بگرین، دەست جەوهەرێکی کەموکوڕە. بەڵام ئەگەر بەتەنیا لەبەرچاوی بگرین، جەوهەرێکی کامڵە. ڕێك بەهەمان شێوەش، نەفس و جەستە، کۆیەکی یەکتا پێکدەهێنن بەناوی مرۆڤ کە ئەگەر لە پەیوەندییان بەم مرۆڤەوە لەبەرچاویان**

**بگرین، جەوهەرگەلێکی کەموکوڕن، وەلێ ئەگەر هەر یەکەیان بە تەنیا بخەینە بەرچاو، کاملن. چونکە بەهەمان شێوەی کە درێژبوونەوە، پارچەپارچە بوون، فۆرمداری و شتی لەم جۆرە، وێنە یان خەسڵەتگەلێکن کە لە ڕێگەیانەوە جەوهەرێك بەناوی *لەش* دەناسم، بەهەمان شێوەش فامیدەیی، دوودڵی، ئیرادە و شتی لەم جۆرە، ئەو فۆرمانەن کە لە ڕێگەیانەوە جەوهەرێك دەناسم بەناوی *نەفس* و دەزانم کە بەهەمان ئەندازەی کە جەوهەری درێژبۆوە، بوویکی کاملە، ئاواش جەوهەری بیرکەرەوە، بووێکی تەواوە"[118].**

بەپێی بیروڕای دیکارت، هەروەکو لە پێشاندا گوتمان، خاڵی سەرهەڵدانی مەعریفە بریتییە لە (من)ی ئەزموونگەر و بیرکەرەوە. ئەم جەوهەرە بیرکەرەوەیە کە جەوهەرێکی نەفسییە، دەتوانێ شوناسی دەرەوەی ماتەریالی، یاخود واقعی فیزیکی، بەهۆی یاسا میکانیکییەکانەوە، بکات. دیکارت لە پێناسەی نەفس دا، نووسیویەتی:

> **"ئەو جەوهەرەی کە هزر بەشێوەیەکی بێ نێوان (بێ واسیتە)، تیایدا ئامادەیە، ناو دەنێم نەفس" لێرەدا من وشەی نەفس لە جێگەی ڕۆح بەکار دەهێنم، چونکە وشەی ڕۆح تەمومژاوییە و زۆرجار بۆ شتە جەستەییەکان بەکار دەهێنرێ"[119].**

بەمەشدا دیارە دیکارت بەو پێناسەیەی پێشووتریدا بۆ نەفس کە لە کتێبی ڕامانەکاندا کردبووی، دەچێتەوە، کە تیایدا گوتبووی **"نەفس وەك ئەوەی با، ئاگر، یاخود ئەتیر(کزەبایەکی فێنك) وایە کە بەنێو ئەندامە درشتەکانی لەشمدا پەرتە دەکات"[120]**. لەمەوە تێدەگەین کە (من)ی بیرکەرەوە جەوهەرێکی نا مەتریاڵییە، وەلێ دەتوانێ شوناسی شتە ماتەریالییەکانی دەوروبەری خۆی بکات. بەم پێیەش "خەسڵەتی

بنەمایی جەوهەری نەفسی بریتییە لە بیرکردنـەوە، لەکاتێکدا خەسڵەتی سەرەکیی جەوهەری ماتەریاڵی بریتییە لە درێژبوونەوە"[١٣١]

دیکارت لەو بڕوایەدایە جگە لە هوشیاری مرۆڤ، جگە لـە جەوهـەری نەفس، ئـەوە هـەموو واقیـع وەك دیاردەگـەلێکی خـۆبزوێن و ئۆتۆمـاتیکی وایـە، کـە پێکهـاتووە لـە قـەبارە و مـاددەی درێـژەوە بـووی ماتـەریاڵی، کـە بەردەوام لە بزووتنەوەدان و پشتگیری لە یەکتری دەکەن.

ئـەو بـە درێـژایی بەشـی پێنجـەم لـە کتێبـی (میتـۆد)دا[١٣٢]، بـاس لـەو جیهانــە میکانیکییــە دەکــات و چــەند جــارێ دووپاتــەی دەکاتــەوە، کــە زینــدەوەرەکان، دیــسانەوە بێجگــە لــە مــرۆڤ، هــەموویان وەك ماشـێن و دەزگای خـۆ بـزوێن (ئۆتۆماتیـك) وەهـان و هـیچ چالاکییەکی هۆشـەکی و نەفسییان نییە. لەم ڕووەوە، دیکارت هیچ گومانێکی لـەوە نییـە کـە تـەنیا مرۆڤە، یان نەفسی مرۆڤە کە هەنـدێ چالاکیی دەروونـی هەیـە. هەرچی ئاژەڵەکانن، وەك ئامێرێکی خۆ بزوێن و بێ نەفسن و تەنانەت هەست بـە هــیچ ئــازار و دەردێ ناکــەن[١٣٣]. بۆیــە تەنانــەت ئاژەڵــەکانیش نــاتوانن مەعریفەیـەکیان لـەبارەی دنیـای دەوروبــەری خۆیانــەوە هـەبێت. تاقـە جەوهــەرێکی بیرکــەرەوە (مــن)ی بیرکــەرەوەی مرۆڤــە، کــە ئــەویش جەوهـەرێکی غـەیرە مادییـە و لـە شـوێندا جـێگیر نـەبووە و نابینرێـت و بەرجەســتە نــاکرێ. تــەنیا جەســتەی مــرۆڤ نــەبێ کــە مادییــە و درێژبوونــــەوەی لــــە شــــوێندایە و وەك هــــەر گیانــــدارێکی دیکــــە ئۆتۆماتیکیانەیە[١٣٤].

دیکارت، دان بەوەدا دەهێنێ دنیای دەرەوە هەیە، جیهانێکی ماتـەریاڵی و لـە شـوێندا جێگیربـوو هەیـە، کـە دەتـوانین وەسـفی بکـەین و بـەهۆی زانـستە سروشـتییەکانەوە لێکـی بدەینـەوە. بـەڵام ئـەو جیهانـە دەرەکییـە هـیچ هێزێکـی خۆناسـین و هـیچ هوشـیارییەکی نییـە بـە بـوونی خـۆی. لێــرەوە بیرکردنــەوەی دیکــارت لەســەر بنەمایــەکی دوالیــستی و جــووت جەمــسەرییەوە دامــەزراوە، چــونکە ئــەو بــڕوای وایــە واقیــع لــە دوو

جەوهــەری بنــەمایی پێکهــاتووە: یــەکێکیان نەفــسی و ئەویتریــشیان ماتەریالییــە: **"کــۆی هــەوێنی نــەفس بیرکردنەوەیــە و کــۆی هــەوێنی جەستەش بریتییە لە درێژبوونەوە و لە نێوان هزرین و درێژبوونەوەشدا هیچ خەسڵەتێکی هاوبەش لەئارادا نییە"**[١٢٥] و ئەم دووانـە تـەواو لێکدی جیاوازن. بۆ پـتر ڕوونکردنـەوەی مەبەسـتەکەی دیکـارتیش ئـەم خـشتەیە دەخەینە پێش چاو، کە بۆ ئەم مەبەستە ئامادەمان کردووە:

**دوو جۆر جەوهەر**

| جەوهەری نەفسی | جەوهەری ماددی |
| --- | --- |
| هوشیاری پەتییە | درێژبوونەوە (امتداد)ی پەتییە |
| لە شوێن (مکان)دا نییە | لە شوێن (مکان)دا جێگیرە |
| دەتوانێ شوناسی شتەکان بکات | ئاگایی نییە تا بتوانێ شوناس بکات |
| پارچە پارچە ناکرێت | پارچە پارچە دەکرێت |

**هەڵسەنگاندن و پێشنیار:**

هەروەکو لە سەرەتای ئەم لێکۆڵینەوەیەوە نووسیمان: تەمەنی هزری و فەلسەفیی دیکارت لە تەمەنی جەستەیی ئەو دوور و درێژتر بـوو. ئـەمڕۆ و لە داهاتووشدا، کاتێ ئاوڕ لە دیکارت و فەلسەفەکەی دەدرێتەوە، ئاساییە لەگەڵیـدا هـاوڕا یـاخود دژی بـین، بـەڵام گرنگـە ئـەم هـاوڕایی و دژبوونـە لەســەر بنــەما و لــەپاش توێژینــەوە لــە بابەتــە ســەرەکییەکانی بــیری دیکارتــەوە هاتبــێ. بۆیــە بــەبێ توێژینــەوە لــە میتــۆدی گومانکارانــەی دیکــارت، ئــەقڵباوەڕیی دیکــارت، دوالیــزم و بیرۆکــە زگماکــەکان و هتــد.. ناتوانین دیکارت وەك فەیلەسووفێك بناسین و بـۆ ناسـین و تێگەیـشتنێکی سـەرجەمگیرتریش لـە بیروڕاکـانی دیکـارت، هـەر تـەنیا سـێ کتێبەکـەی (میتۆد، ڕامانە میتافیزیکییەکان و بنەڕەتـەکانی فەلـسەفە)، بـەس نـین و

گرنگــە توێــژەر بــە وردی کتێبــی (ناڕەزایــەتی و وەڵامــەکان)یــشی خوێندبێتەوە.

ناسینی دیکارت بۆ ئێمەی کورد، لەدەرەوەی ئەوەی لەسەری نووسراوە، گرنگیــی تایبــەتی خــۆی هەیــە، چ وەك ئــەوەی بەشــێکە لــە ڕەوتێکــی دوورودرێــژی فەلــسەفەی خۆرئــاوا و چ وەك ئــەوەی یارمەتیدەرێکــە بــۆ پێکهێنانی بیرکردنەوەیەکی ئەقڵانییانە و میتۆدیك، کـە بـەپێی پێویـست بە کوردی لەسەری نەنووسراوە.

دیکـارت بیرکردنــەوە ئاراسـتە دەکـات بـۆ بیرکردنــەوە لـە ژیـان و شـتە ئاساییەکان، لەو ڕێگەیەشـەوە بـوار بـۆ خوێنـەر دەرەخـسێنێ تـاکو مەشـق لەسەر بیرکردنەوە بکات و ئەوەی بیری لێ دەکاتـەوە، بـەجۆرێ لـە زەینـی خۆیـدا بخـەملێنێ کـە هـیچ نـەبێ بۆخـۆی لێـی تێبگـات و ببێتـە (منێکـی بیرکەرەوە). لەبەر تیشکی ئەم تێڕوانینەوە ئێمە چەند ئەنجامێك کە لـەم توێژینەوەیەدا بەدەستمان هێناوە، دەخەینە پێش چاو.

**یەکەم**: ئێمە توێژینەوەکەمان بە زمانی کوردییە و لەو چوارچێوەیەدا کە ئەم زمانە ئیمکانی بیرکردنەوەمان بۆ دەڕەخسێنێ، قسەمان لە چەمك و زاراوە و فەلـسەفەی دیکـارت کـرد. گریمانــەی ئـەوەمان خـستبووە پـێش چـاو، کــە بەگەڕانــەوە بــۆ بەرهەمــە فەلــسەفییە گرنگــەکانی دیکـارت، دەتوانرێ لە چۆنایەتی بیرکردنەوەکەی بـەپێی شـیاوەکی و توانـای زمـانی خۆمان، تێبیگەین. یەکێ لەو زاراوانەی گریمانەکەمان پشتی پێیدەبەسـت، زاراوەی ئەقڵ، یان ژیر بوو. ئەنجامی توێژینەوەکـە ئـەوەی دەرخـست، کـە نزیکەی هەموو بەکارهێنانەکانی وشەی ژیر و ئەقڵ لەناو زمانی کوردیدا، بەتایبەتی دیالێکتی سۆرانیدا، پابەنـدن بـە بەکارهێنانـە ڕۆژانەییەکـەیان لەئاسـتی زمـانی ڕەمـەکی، نـەك پابەنـد بـن بـە زمـانی زانـستی لـە ئاسـتە فەلـسەفیەکەیدا. بـەم جـۆرەش زمـانی ڕۆژانـە هەمیـشە گـەرانت نییـە بـۆ بەرجەستەکردنی مانای زانستی و فەلسەفییانەی ئەو وشانەی لەو زمانەدا بـەکاردەهێنرێن. ئـەم مەسـەلەیە هـەر تـەنیا پەیوەسـت نییـە بـە بـوونی

زمانەوە، بەڵكو پەیوەستیشە بە هەبوونی کەلتوور و نەریتی زانستی و فەلسەفییەوە لەناو ئەو زمانەدا. ئەگەر ئەو کەلتوور و نەریتە لەناو زمانەکەدا نەبوو، ئەوە بەکارهێنانی وشە و زاراوەکان لەو زمانەدا، بۆخۆیان دەتوانن ببنە ڕێگر لەبەردەم تێگەیشتنی فەلسەفییانە لە هەمان وشە و زاراوە. چونکە ئەو زمانەی لە دەربڕین و هزرینی فەلسەفیدا هەژار بێت، ڕێگری لەبەردەم بەرهەمهێنانەوەی فەلسەفییانەی وشە و زاراوەکاندا دروستدەکات و ئەمەش ئەو شتەیە کە پێویستە توێژەرانی بواری فەلسەفە ئاگاداری بن.

ئەگەر زمانی کوردی وەربگرین و بەتایبەتیش شێوەزاری سۆرانی، کە لە چاو شێوەزارەکانی تری زمانەکەماندا، زۆرترین بەرهەمی شێوە فەلسەفییانە و فەلسەفییانەی پێ نووسراوە و بۆ وەرگێڕدراوە، ئەوە هەر زوو تێدەگەین، کە وشە ڕۆژانەییەکانی ئەم زمان و شێوەزارە، بە هەمان شێوەی خۆیان دەبنە کەرەستەی دەربڕینەوەی مەبەستە فەلسەفییەکان. هۆکاری هەرە سەرەکی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کەلتوورێکی باڵادەستی ڕەگەزمەند و پێگەخواز، کە کۆنترۆڵی زمان و بیرکردنەوەی ئێمەی کردووە و ئازادی بیرکردنەوە دەکاتە قوربانیی بەرهەمهێنانەوەی پێگە و ڕەگەز و دەسەڵاتەکەی خۆی. بەم جۆرەش ئەگەر منی بیرکەرەوەی دیکارتی، منێك بێت لەودیو پێگە و ڕەگەزمەندییەوە بە ئازادی بیر بکاتەوە بۆ ئەوەی بوونی خۆی بسەلمێنێ، ئەوە بیرکردنەوەی منی کوردی ئەو ئازادییەی نییە و جەبری کەلتووری نێرسالاری، ئازادی بیرکردنەوەی وەك خودێکی سەربەخۆ، لێ سەندۆتەوە و بەردەوام لە پێناوی بەرهەمهێنانەوەی کەلتوورە باڵادەستەکەی خۆیدا، بوونێکی پێدەبەخشێت، کە ناتوانێ لە ڕێگەیەوە هەبێت و بوونی خۆی بسەلمێنێ.
ئەم قسەیە بەو مانایە تێنەگەین، کە زمانی کوردی شیاوەکی بەکارهێنانی فەلسەفییانە و زانستییانەی نییە. بەڵكو بەو مەبەستەیە کە پێویستە لەناو ئەم زمانەدا، نەریت و کەلتووری فەلسەفی بەرهەم بهێنرێت و

توێژەرانی ئەو بوارە، پسپۆڕان و تەنانەت ئەو وەرگێڕانەش کە خۆیان بە کاری وەرگێڕانی دەق و بابەتی فەلسەفییەوە، ماندوو دەکەن، ئاگاداری ئەوە بن کە لەبەردەم چ ئەرکێکی گرنگدان، کە بریتییە لە ئامادەکردنی زمانی کوردی و فراوانکردنی چوارچێوە لۆکاڵییەکانی بەکارهێنانی ئەم زمانە، بۆ ئەوەی ببێتە زمانێکی فەلسەفییانە.

**دووەم:** وشە و زاراوەکانی وەك ئەقڵ، ئەقڵانییەت و ژیرباوەڕی، لە مێژووی کەلتوور و هزرینی فەلسەفییانەی خۆرئاواییدا، ئەگەرچی ستاندارد و هاوتا نین، بەڵام پێشینەیەکی دێرینەیان هەیە. مانای گشتی و مانای فەلسەفییانەی ئەم زاراوانە لەو مێژووەدا، لێکتر جودا کراونەتەوە و سنووریان بۆ دیاری کراوە. هەروەها قوتابخانە فەلسەفییەکان و فەیلەسووفە جیاوازەکان، کاریان لەسەر قووڵکردنەوەی مانای ئەم زاراوانە کردووە و تایبەتمەندیی خۆیان پێ بەخشیون، کە لەناویاندا (ئەقڵی گەردوونی، ئەقڵی تیۆری، ئەقڵی پراکیتیکی و ئەقڵی ئامرازگەرا) دیارترین شێوەکانی بەکارهێنانی زاراوەی ئەقڵن. گرنگترین تایبەتمەندیی کەلتوور و هزری ئەوروپایی، لە هەڵوێستیدا بەرامبەر بە ئەقڵ، ئەوەیە کە ئەقڵ وەك ڕێباز و ڕێچکەیەکی بیرکردنەوە ***هەڵدەبژێری*** و ***باوەڕی*** پێدەهێنێ. باوەڕهێنان بە ئەقڵ، کە خۆی لە ڕێبازی ئەقڵانییەت، یان (ڕاشیۆنالیزم)دا بەدیار دەخات و لە سەدەی حەڤدەیەمدا بەرجەستە دەبێت، لەسەر ئەو بنەمایەوە بەندە کە ئەقڵ دەمانگەیەنێ بە مەعریفەی ڕاستەقینە و دڵنیا. ئەمە جگەلەوەی ئەقڵ، بەخششێکی یەزدانییە و نیشانەیەکی خوداییە لە مرۆڤدا کە توانای بیرکردنەوەی دەداتێ تاکو کێشەکانی خۆی بەهۆیەوە چارەسەر بکات.

**سێیەم:** بەو پێیەی ئێمە سوودمان لە دەقە فەلسەفیی و بنەڕەتییەکانی دیکارت وەرگرتووە و تەنانەت بەو پێیەی یەکێ لەو سەرچاوانەی ئێمە بۆ وردبوونەوە لە زاراوە و پێناسەکان سوودمان لێ وەرگرتووە، پێشتر لە هیچ سەرچاوەیەکی تردا بە زمانەکەمان،

بەکارنـــەهاتووە[١٣٦]، دەتـــوانرێ بگـــوترێ: دیکـــارت لـــە خـــستنەڕووی مەبەستەکانیدا ڕوونە، وشە و زاراوەی گونجاوی پێویـست بـەکار دەهێنێت و بـۆ هـەر زاراوەیـەك، یـان وشـەیەك پێناسـەیەك و چـەندین لێکدانـەوە دەخاتە ڕوو. هەروەها لە سەرچاوەیەکییەوە بۆ یەکێکی تر، ئەم پێناسە و لێکدانەوانە کەمترین ناکۆکییـان لـە نێواندایـە و هـەموو ئەمـەش بەڵگـەن لەسەر ڕوونی بیرکردنەوەی دیکارت و نەبوونی ئاڵۆزی و ناکۆکی لە هـزری ئەودا. دیکارت هـەر یـەك لـە زاراوەکـانی وەك: خـودا، بیرۆکـە زگماکـەکان، ئـەقڵ، میتـۆد، جەوهـەر، دوالیـزم (جەسـتە، نـەفس)، بـە ڕوونـی پێناسـە دەکات و دەیانخاتە ڕوو، بەڵام وەکو پێویست نایان سەلمێنێ.

**بۆ نموونە:** دیکارت هەم لە کتێبی ***میتۆد*** و هەم لە کتێبی ***ڕامانەکان***دا، تیـۆرە مەعریفییەکـەی خـۆی لـە چـوار بنـەمادا خـستۆتە ڕوو، کـە بەهۆیانەوە، شێوەی گەیشتن بـە ئـەنجامی لـۆژیکی پێـشنیار دەکـات، بـەڵام ئێمـە لـە هـیچ کامـێ لـەو دوو کتێبـە و لـە هـیچ سەرچـاوەیەکی دیکـەی دیکارتدا، بەڵگەی پێویست و وردمان بۆ سەلماندنی بنەماکان نەدۆزییـەوە. بێگومان هەندێ لەم بنەمایانە ڕاستن، بەڵام دیکارت نایان سەلمێنێ، بـەڵکو تەنیا دەیانخاتـە ڕوو. لەکاتێکیـشدا گریمانـەی ئـەوەش بکـەین، کـە هـەموو ئەو بنەمایانەی دیکارت بۆ بەدەستهێنانی ئەنجامی لۆژیکی دەیانخاتە ڕوو، ڕاسـت بـن، ئـەوە بـۆ هەنـدێ بـارودۆخ و هەڵوێـست نـاگونجێن. پرسـیارە ئیتیکی و مۆراڵییەکان هەمیشە ناچـنە ژێربـاری وەڵامدانـەوەی لـۆژیکی و ڕاسـتەقینەوە و نـاتوانرێ بـەهۆی ئـەو بنـەما ماتماتیکییانـەی دیکـارت دەیانخاتە ڕوو، بڕیاریان لەسـەر بـدرێ و بـسەلمێنرێن. ئەمـەش نـەك هـەر تـەنیا سـەبارەت بـە مەسـەلە مـۆراڵ و ئیتیکییـەکان، بـەڵکو سـەبارەت بـە هـەموو ئـەو شـتانەی نـاو ژیـانی مـرۆییش ڕاسـتن، کـە تایبەتمەندییـەکی جیاوازتریان هەیە و ناکرێ ماتماتیکییانە لێیان تێبگەین.

**چوارەم:** سەبارەت بە چۆنێتی سـەلماندنی بـوونی خـوداش دەکـرێ ئـەم سـەرنجە دەربـبڕدرێ. دیکـارت ئـەم بەڵگەیـە بـە شـێوەیەکی لـۆژیکی بینـا

دەکات، بەڵام سەلماندنەکەی لاوازە. کێ دەڵێ بیرکردنەوە لە شتێکی کامڵ، بۆخۆی بیرکردنەوەیەکی کاملاَنەیە. مادام بیرکەرەوەکە مرۆڤە و هیچ بەڵگەیەك لەسەر کەماڵی مرۆڤ لە ئارادا نییە، چۆن دەتوانرێ بیرکردنەوەی ئەو لە یەزدان بە بیرکردنەوەیەکی کامڵ دابنرێ؟ هەتا خاڵی دەستپێکردنی دیکارت مرۆڤ سەنتەرانە بێت، دەکرێ بپرسین: چۆن مرۆڤ کە بۆخۆی کامڵ نییە، دەتوانێ بیر لە کەماڵ بکاتەوە، لەکاتێکدا دەرکی ئەو بۆ کەماڵ سنووردارە و لە چوارچێوەی تێگەیشتنی ئەو، وەك بیرکەرەوەیەك تێپەڕ ناکات؟

**پێنجەم:** جیاکردنەوەی جەوهەری رۆحی لە جەوهەری مادی و جیاکردنەوەی جەستە لە رۆح لەلای دیکارت، جیاکارەیەکی رەهایە و ئەم دووانە یەکتر ناگرنەوە، چونکە وەك لە نەخشەکەدا بینیمان هەریەکەیان خەسڵەتی سەربەخۆی خۆیانیان هەیە. لێرەشەوە دوالیزمی بیری دیکارت وەك کێشەیەك خۆی ئاشکرا دەکات، چونکە بواری هیچ پەیوەندییەك لە نێوان ئەو دوو جۆر جەوهەرەدا ناهێڵێتەوە. ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر بمانەوێ روونکردنەوە لەسەر ئیمکانی مەعریفە و هەستکردن بخەینە روو، پێویستیمان بە جۆرێ لە پەیوەندی هەیە لە نێوانیاندا، واتە پێویستە پەیوەندیەك لە نێوان نەفس و شتە مادییەکاندا هەبێت بۆ ئەوەی بتوانین باس لە شوناسکردنی مەعریفییانە بکەین. دیکارت بواری ئەم پەیوەندییە ناهێڵێتەوە و کاتێکیش باس لە پەیوەندییەکی ئەوتۆ دەکات، تەواو روون نییە[١٣٧] بەڵام ئەگەر لە روانگە دوالیستییەکەی خۆیەوە تەماشای ئەو کاریگەرییە بکەین، دەبینین: دیکارت کەوتۆتە ناکۆکییەوە لەگەڵ هزری خۆیدا. چۆن دەکرێ شتێکی مەتریاڵی ببێتە هۆی کاریگەریی خستنەسەر شتێکی رۆحی نامەتریاڵی و بەپێچەوانەشەوە؟ بە مانایەکی دی: چۆن شتێ کە هوشیاریی پەتییە و لە شوێندا جێگیر نییە، دەتوانێ کاربکاتە سەر شتێ کە جێگیرە و بەرجەستە و دیارە و هیچ هوشیارییەکی نییە؟ ئەم ناکۆکییە وای کردووە دیکارت لەسەردەمی ژیانی خۆشیدا رەخنەی لێ بگیرێت و هەڵەکانی دەستنیشان بکرێن[١٣٨].

**شەشەم:** دیکارت فەیلەسووفی ئەقڵ و یەکێکە باوەڕداران بە ئەقڵی مرۆیی. دیکارت لە زەمینەیەکی فیکری و کۆمەڵایەتی و کەلتووریی داخراوی دۆگماتیکیانەدا بیری لە سەرەتایەکی نوێ بۆ مرۆڤ دەکردەوە. هزری ئەو، کە بە گومانکردن لەهەر میراتێکی پێشینە و هەر بڕیارێکی نەرێتپەسەند دەستی پێکرد و گرنگیی توانای عەقڵیی مرۆڤی هێنایەوە پێش، مژدەهێنەری لەدایکبوونی زەینییەتێکی نوێ بوو. دیکارت بەدیهێنەری زەینییەتێکی نوێیە کە خەسڵەتە جەوهەریەکەی بیرکردنەوە و گومانکارییە و ئەمەش خاڵی جیابوونەوەی ئەم مرۆڤە مۆدێرنەیە لە ئینتیمای بۆماوەیی و کوێرانەی بۆ ڕابردوو. لەگەڵ تێڕوانینی دیکارتدا بۆ مرۆڤ، تاکەکەسی سەربەخۆ لەدایك دەبێ، کە ڕێنماییە دروستەکانی عەقڵ دەکاتە سەرمەشقی خۆی، تا خۆی لەهەر هەڵەیەکی مەنتیقی بپارێزێ.

ئەو زەینییەتە گومانکارە بۆ ئێستای ژیانی کەلتووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و زانستیی ئێمە، لەهەر کاتێکی تر پێویستترە. ئێمە هەرکات بمانەوێ بیر بکەینەوە و گومان بکەین، لە دیکارتەوە زۆر شت فێر دەبین، بەڵام ئەو فێربوونە بە دەرخکردنی دێڕەکانی دیکارت و بەپەلە گوتنەوە و جوینەوەیان مەیسەر نابێت، بەڵکو پێویستی بە (ڕامان)ی جیدیە، تاکو ئەوەی بەهێمنی فێری دەبین لە تێپەڕینی کاتدا، ببێتە بەشێ لە سروشتی ڕۆشنبیریمان. ئەوکاتەش توانیومانە تێگەیشتنێکی دیکە لە چەمکی ئەقڵ لە زمانەکەماندا بهێنینە بەرهەم، کە هەردەبێ ناوی بنێین: ***تێگەیشتنی عەقڵانییانە لە ئەقڵ.*** تا ئەوکاتە لە کۆمەڵگا و ژیانی کەلتووریی ئێمەدا، ئەقڵ لە تاراوگەکراوێك دەچێ کە ماڵە ڕاستەقینەکەی لەلایەن خورافە و نەرێتە کۆن و دژە عەقڵانییەکانەوە، لەلایەن بڕیارە پێشینەکانی ناو زەینەوە، زەوتکراوە.

ئاگاداریی لە دیکارت هەر لە قۆناغەکانی بەرایی خوێندنەوە تاکو خوێندنی باڵا بۆ قوتابیانی ئێمە پێویستە، چونکە هزری دیکارت، مرۆڤ

ناچار دەکات مەشق بە بیر و مێشکی خۆی بکات. ڕەنگە لە جیهانی ئەمڕۆشدا کە ئەقلانییەت دەستەواوی بۆ ژیانی مرۆڤایەتی، هەمیشە خۆش و بەسوود نەبووە، جێگەی ڕەخنەی زۆر بێت، وەلێ لە واقیعی ئێمەدا کە واقیعێکی بارگاوی بووە بە حوکمی نەریتەکان و ستەمی دووبارەکردنەوەیان، باوەڕکردن بە ڕێبازی عەقلانییانەی دیکارت، لەناو کۆمەڵێك باوەڕی دیکەدا، دەشێ هەڵبژاردنێکی عەقلانییانە بێت.

سەرەتای ۲۰۰۸

**پەراوێزەکان**

(۱) ئەم کتێبانە لە بەرگێکدا و بەناونیشانی (**چەند وردبوونەوەیەك لە بارەی میتافیزیکەوە**) بڵاوکرانەوە، کە ئەمە تایبەتمەندییەکانیەتی:

**- ڕینێ دیکارت: چەند وردبوونەوەیەك لە بارەی میتافیزیکەوە. وەرگێڕانی لە ئەڵمانییەوە: د. حەمید عەزیز، وەزارەتی ڕۆشنبیری، بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان، سلێمانی ۲۰۰۵.**

(۲) دەستەواژەی (فەلسەفەی نوێ) یان (Modern philosophy)، لەم بەکارهێنانەی ئێمەدا چەند لێکدانەوە و مەبەستێك لەخۆی دەگرێ:

یەکەم: بەواتای ئەو فەلسەفەیەی کە جیاوازە لە فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان، کە ئەویش بریتی بوو لە قۆناغی پێش سوکراتی، قۆناغی سوکرات، ئەفلاتوون و ئەرستۆ و قۆناغی هیلینیستی.

دووەم: بەمانای ئەو فەلسەفەیەی کە جیاوازە لە لاهووتی مەسیحییەت لە سەدەکانی ناوەڕاستی ئەوروپا، کە تیایدا فەلسەفە لەژێر ڕکێفی تیۆلۆژیا، یاخود یەزدانناسیدا بوو.

سێیەم: بەمانای ئەو فەلسەفەیەی کە زیاتر بە زمانی نەتەوەیی نووسراوە، نەك زمانی لاتینی کە پردی گواستنەوەی میراتی یۆنانی و یەهوودی بوو و دواجار شارستانیەتی ئەورووپی دروستکرد.

چوارەم: بەمانای فەلسەفەیەك، کە خۆی بۆ کێشە دنیایی و مرۆییەکان تەرخاندەکات و دەبێتە فەلسەفە لە پانتایی ژیاندا. واتە خۆی بە لێکدانەوە و وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەوە سەرقاڵ دەکات، کە پرسیار و ڕامانی مرۆڤی واقیعی و هەنووکەیی و زیندوون.
پێنجەم: هەروەها مەبەستمان لە نوێ، ئاماژەیە بە کات و سەردەم و جوگرافیایەکیش کە ئیدی پێش خۆی بە کۆن، بە ڕابردوو لەقەڵەم دەدا و بەهۆی ئەو ناونانەیشەوە مەودایەکی لە نێوان (ئێستا) و (ڕابردوو)دا دروستدەکرد.
ناوهێنانی دیکارت و فەلسەفەکەی بە فەلسەفەی نوێ، هەموو ئەم مانایانە و چەندین مانای تریش لە خۆیان دەگرن، بەڵام ئەوە بەمانای ئەوە نییە دیکارت دابڕان و پچڕانی بنەبڕی لەگەڵ فەلسەفەی پێش خۆی، بەتایبەتیش لەگەڵ فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست هێنابێتە کایەوە. بڕوانە پێشەکی وەرگێڕی کوردی بۆ سێ بەرهەمەکەی دیکارت، ل: ٦-٧

(٣) د. جميل صليبا: **المعجم الفلسفي**، ط اولى، الجزء الثانى، ذوي القربى، قم، ٢٠٠٦، ص ٨٤

(٤) Poul Lubcke(Redigeret): **Politikens filosofi leksikon**, Politikens Forlag, Copenhagen, 1996, s. 136

(٥) بۆ نموونە بڕوانە:

- Justus Hartnack: "*Sprog og Virklighed*" in: Malthe Jacobsen: **Sprog og Virklighed**, Gyldendal, Copenhagen, 1973, s. 29-48

(٦) سزان مولر أكين: **زن از ديدگاه فلسفهء سياسى غرب**. ترجمه و تاليف: ن. نورى زاده، تهران: قصيده سرا، ١٣٨٣ (٢٠٠٤)، ص: ١٢ و بەرەودوا.

(٧) سەبارەت بە نێرانەبوون و ڕەگەزمەندی وشەی ئەقڵ و بەکارهێنانی ئەم وشەیە لە فەلسەفەی خۆرئاوادا، بەتایبەتی لە ئەفلاتوونەوە تاکو هیگل، بە تێپەڕین بە (بیکۆن، فیلۆن، ئاگۆستین، ئەکویناس، دیکارت، ڕۆسۆ و کانت)دا، بڕوانە ئەم سەرچاوەیە:

- لوید، ژنویو. **عقل مذکر** (مردانگی و زنانگی در فلسفهء غرب)، ت: محبوبەو مهاجر، ١٣٨١(٢٠٠٢).

هەروەها سەبارەت بە بیروڕای فەیلەسووفانی **فەلسەفەی سیاسی** بۆ مێیینە و نێرانەبوونی زمانی فەلسەفەکەیان، بڕوانە: سەرچاوەی پێشووتر: سوزان مولر آکین: **زن از دیدگاه فلسفهء غرب**. ترجمه و تالیف: ن. نوری زاده، تهران: قصیده سرا، ١٣٨٣ (٢٠٠٤)، بەتایبەتی ئەو بەشانەی بۆ توێژینەوە لەسەر ئەفلاتوون و ئەرستۆ و ڕۆسۆ تەرخانی کردووە.

(٨) لەم بارەیەوە بڕوانە: کلود ریویر: **درآمدی بر انسان شناسی**. ت: ناصر فکوهی، تهران: نشر نی، ٢٠٠٠، ص: ٣٧

(٩) ییتس، دانیل. **انسان شناسی فرهنگی**، ت: محسن ثلاثی، تهران، انتشارات علمی ١٣٨٥(٢٠٠٦ ز.) ص: ٤٦٥ـ٤٦٦

(١٠) ییتس، دانیل. **انسان شناسی فرهنگی**، سەرچاوەی پێشوو، ١٣٨٥، (٢٠٠٦ز.) ص: ٤٦٧، ٤٧١ـ٤٧٢.

(١١) "تەنیا ئەوانەی لە ڕووی جەوهەرەوە دەتوانن خۆیان بە یەکێ لە خێڵی (ئێمە) دابنێن، سەر بە خۆمانن و خوێنی پاك لە دەمارەکانیاندایە، دەنا لە دەرەوەی پانتایی خێڵ، خێڵە بێگانەکان دەژین. چونکە بێگانەکان جەوهەرێکی هاوبەشیان لەگەڵ خێڵی ئێمەدا نییە". بڕوانە:

- ڕێبوار سیوەیلی: **پانتاییەکانی دەسەڵات**: *"باسێکی تیۆری لەسەر پەیوەندییەکانی نێوان (حکومەت، خێڵ، شار و خێزان) لە کۆمەڵگای کوردیدا"*. لە گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢٧)، ٢٠٠٣، ل: ١٩

(١٢) سیوەیلی، ڕێبوار: **کتێبی نالی**، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، بەشی سێیەم "لە ستایشی کەردا" بە ئینسانکردنی حەیوان لە جیهانبینی نالی دا"، ٢٠٠١، ل: ١٦٩

(١٣) نالی نووسیویەتی "زوبانی حاڵی"، نەك "بێ زوبانی"، یان "زمانی ناحاڵی"، کە کورد بۆ وەسفی ئاژەڵ بەکاریان دەهێنێ. زوبانی حاڵییش، زمانی بوونەوەری عاقڵی وەك مرۆڤە.

